نووسینی

بلەچ شێرکۆ

محەمەد حەمە باقی

لە عەرەبییەوە کردووتی بە کوردی



چاپی سێیەم

١٩٩٢

دکتور

بلەچ شێرگۆ

# کێشەی کورد

## مێژینە و ئێستای کورد

محەمەد حەمە باقی

لە عەرەبیەوە کردوویەتی بە کوردی

چاپی سێیەم

١٩٩١

ناوی کتێب   کێشەی کورد
نووسینی : دکتور بلەچ شێرگۆ
وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە بۆ کوردی : محەمەد حەمە باقی
تایپ : ئاسۆس
مۆنتاژ : دارا
بەرگی دەرەوە : محەمەد زادە
خەتی ناوەوە : ستار
چاپی یەکەم : ١٩٨٦ باخ سەمەر
چاپی دووەم : ١٩٩٠ ئێران ـ تەوریز
چاپی سێیەم : ١٩٩١ ـ   کوردستانی عێراق
تیراژ : ٢٠٠٠

# پێشکەش

- جەواهیر لال نەهرۆ - لەبارەی سەرکوت کردنی شۆڕشی ـ۱۹۲۰ـ ز - ی کوردستانی تورکیاوە ئەڵێ :

" .. دوای ئەوەی - کەمال پاشا - بنبەزەییانە کەوتە گیانی کورد و ، دادگای تایبەتی بۆسزادانیان دانا و ، هەردوسەرکردە : شێخ سەعیدو دکتۆر فوئاد و ، چەندانی تریشی لەوانە لەسێدارەدا ، کەتا گیانیان دەرچوو ، ئاواتی رزگاری کوردستان لەسەر لێویان بوو ... بەم جۆرە ئەم تورکانەی لەم دواییەدا ، بۆئازادی خۆیان جەنگان ، کورد - یان سەرکوت کرد، کەداوای ئازادی ئەکرد..! چەند سەیرە نەتەوەیەک بگاتە ئەوەی لەداکۆکی نیشتمانەوە بگۆڕدرێت بۆ هێرش ،بۆزەوتکردنی سەربەستی خەڵکی تر...! لەساڵی (۱۹۲۹ ز)شدا دوبارە کورد راپەڕینەوە، شۆڕشەکەیان تا کاتێکی تر دامرکایەوە.. بەڵام چۆن شۆڕشی نەتەوەیەک بۆ هەتاهەتایە ، لەناو ئەبرێ ، کە نەتەوەکە سوربێ لەسەر سەندنی ئازادی و، ئامادەش بێ نرخەکەی پێشکەش بکات ؟ "

** ** **

ئەم کتێبە پێشکەشە بەوانەی کەتا گیانیان دەرئەچێ ، ئاواتی رزگاری گەل ، لەسەرلێویانە .

محەمەد حەمەباقی

# بەرایی

**محەمەد حەمە باقی**

ئەم کتێبە لە ساڵی ـ ١٩٢٠ ز ـ دا وەک پێنجەمین بڵاوکراوەی ـ کۆمەڵەی خۆیبوون ـ ی سیاسی کوردی، بە زمانی عەرەبی لە ـ قاهیرە ـ، لە لایەن دکتۆر ـ بلەچ شێرکۆ ـ وە بە چاپ گەیەندراوە لە ڕاستیدا وەک پێش ماوەیەک سۆراخ کراوە، دکتۆر ـ بلەچ شێرکۆ ـ ناوی خوازراوی نووسەری بەهرەوەری کوردپەروەر: مامۆستا ـ محمد عەلی عەونی ـ[1] یە، کە ئەویش بە هاوکاری نووسەری کوردپەروەر و بنەچەوخانەوادە کوردپەروەر: مامۆستا جەلادەت بەدرخان[2] نووسیویتی وەک ئەڵێن زوربەی زانیاریەکانی کتێبەکە ـ جەلادەت بەدرخان ـ داویێتی بە ـ محمد علی عەونی ـ و، ئەویش بە وەعەرەبیە تۆکمەیەی خۆی، بۆ ڕای گشتی خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی عەرەب ـ ی نووسیوە.[3]

هەر لەگەڵ چاپ وبڵاوبوونەوەی ئەم کتێبەدا لە میسر، باڵیۆزی حکومەتی تورکیا، لە میسر، بەپەلە بەناوی حکومەتی تورکیاوە نارەزاییەکی توندی دا بە حکومەتی میسر، کە چۆن ڕێگا ئەدرێ بە نەیارانی دەوڵەتی تورکیای دۆستی میسر، کتێبی وا لە دژی تورکیا لە میسر بڵاو بکرێتەوە. بۆیە دەست بەجێ بەرپرسانی حکومەتی میسر فرمانی کۆکردنەوەو قەدەغەکردنی ئەم کتێبەیان دەرکرد. بەلام پاش ئەوەی ژمارەیەکی کەمی گەیشتبووە وڵاتانی دەرەوە.

---

1ـ محمد عەلی عەونی: ساڵی 1897ز ـ لە کوردستانی تورکیا لە شاری ـ سویرەک ـ ی لەدایک بووە، باوکی سەرۆکی ـ هۆزی ـ بووە، پلەی یەکەم و دووەمی خوێندنی لە تورکیا تەواوکردووە، بۆ خوێندنی زانستی ئاینی وعەرەبی چۆتە میسرولە قاهیرە، لە ـ ئەزهەر ـ خوێندوویەتی و کارنامەی بەرزی سەندووە، زمانی فارسی و فەرەنسیشی زۆرباش زانیوە.

لەگەڵ بەدرخانیەکاندا لە دامەزراندنی کۆمەڵەی ـ خۆیبوون ـ دا بەشدار بووە، لە بەر کوردایەتی کردنی، تورک نەیانهێشتووە بگەڕێتەوە نیشتمانی خۆی و، هەر لە میسر ماوەتەوەو لە دیوانی شاهیدا بەوەرگێری زمانە ڕۆژهەڵاتیەکان دامەزراوە.

زانای دلسۆزی کورد : محمدعەلی عەونی

کتێبەکە ئەگەرچی ناوی - کێشەی کوردو مێژینەی کورد وئێستایان - ە بەڵام سەرومڕ ، بەڵگەنامە ، یان راپۆرتێکی خێراو ، راگەیەنراو رێیانەی مێژوییە ، سەبارەت بەو زوڵم و زوردارى وستەمەی ، کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، لە دوای سەدەی پانزەهەمینی زاینیەوە و دوای ئەویش رژێمی تازەی کاربەدەستانی تورکیا ، تا سالانی - 1930 ز - بەسەر کوردستانی تورکیا ، کردوویانە ، لە بەر ئەوە زانیاریەکانی ، تەنانەت ناوی شۆڕش و ، راپەڕین و ، نووسەران وئەدیبانی کورد ، زۆرتر تایبەتن بە کوردستانی تورکیاوە و ، زۆرکەم پەلی هاویشتوونە بۆ پارچەکانی تری

---

شەرەفنامەی فارسی لە چاپ داوەتەوە ، پێشەکی وپەراوێزی زۆر هێژای بۆ نووسیوە ، هەروەها شەرەفنامەی کردۆتە عەرەبی و لە پاش مەرگی ، لە ساڵی 1958 ، وەزارەتی تەربیەی میسر لە چاپی داوە . خولاصەی تاریخی کوردو کوردستان و تاریخی ئول و ئەماراتی کوردی ، ماموستا - ئەمین زەکی - کردوون بە عەرەبی و پەراوێزی زۆر بابەخداری بۆنووسیون .

جزمی دووەمی - مشاهیر الأکراد - ی ئەمین زەکی - لە چاپ داوەتەوە و ، گەلێک نووسراوی بەنرخی لە سەر کوردو کوردستان ، هەیە ، کە تائێستا بڵاونەکراونەتەوە .

لە 11 ی تەمووزی ساڵی 1952 دا کۆچی دوایی کردووە و ، لە قاهیرە ، لە تەکیەی - شێخ مضاوری ، لە - جبل المعطم - لە نزیک گۆڕی - عومەر ابن الفارض - نێژراوە ( شەرەفنامە - لە وەرگێڕانە کوردیەکەی هەژار - ەوە - م ) .

2- لە 1897/4/26 لە کوردستانی تورکیا لە دایک بووە ، لە ئەستەموڵ کۆلیژی پاسا زانسی تەواو کردووە ، کە - ستە فاکەماڵ - جڵەوی کاری لە تورکیا کەوتە دەست ، فەرمانی لە سێدارەدانی جەلادەت بەدرخان و کامەران بەدرخان و سورەیا بەدرخان و ئەمین پاشا - ی باوکیانی دەرکرد . بەڵام هەر چواریان خۆیان دەربازکرد . لە ساڵی 925 ز - دا هەرسێ براکە : جەلادەت وکامەران و سورەیا ، خۆیان گەیاندە شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران ، کە شۆڕشەکە نوشوستی هێنا و ، شێخ سەعیدلە سێدارە درا ، جەلادەت - یش لە 1939/12/25 دا پەنای بردە بەر - سوریا - و ، لەوێ جا بەوە ، تا لە 1951/7/15 ز- دا ، کۆچی دوایی کرد . گەلێ رۆژنامەی دەرکردووە ، دیارترینیان - رۆژنامەی هاوار - و - روناهی - یە . ئەڵمانی وفەرەنسی وئینگلیزی وعەرەبی وتورکی ، بە تەواوی زانیوە ، ماموستا - رەفیق حیلمی - یاداشتەکانی پێشکەش بەگیانی ئەم کەڵە رۆشنبیرە کردووە و ، وتوویەتی : " دیاریە بۆگیانی پاکی دورێک ، کە تا مردن بۆکورد ژیا ... هتد " ( بەکورتی لە : یادداشتەکانی مێجەر نوئێل - ەوە ، وەرگێڕانی حسین جاف وحسین عثمان نێرگزەجاڕی - 1980 ز - (م )

3- لەم بارەیەوە هاوڕێی بەڕێزم کاک دکتور فوئاد حمە معصوم لە ونامەیەیدا ، کە بۆئەم مەبەستە بۆمی نووسیوە ، ئەڵێت :

" عومەر وەجدی ، کە ماوەیەکی زۆر - مشرف - بوو ، لە بەشی کوردی راستەوی قاهیرە و زۆردۆستی - محمد عەلی عەونی - بووە ، چاودێری چاپ کردنی کتێبەکانیشی کردووە و بۆی گێڕامەوە : کە - القضیة الکردیة - لە لایەن جەلادەت بەدرخان - ەوە ، وەک یاداشتێک بە فەرەنسی نووسرا و ، بەڵام محمد عەلی عەونی .لێی زیادکردووە و کردوویەتی بە عەرەبی و ، عومەر وەجدی خۆی سەرپەرشتی چاپ کردنی ئەم کتێبەی کردووە . ( م )

دوردستان . بەلام ئەمە لەونرخە مێژووییەی کەم ناکاتەوە، کەلەدوای دەرچوونیەوە تا ئێستا، مێژوونووسانی کورد و بیانە، زوربەیان لەبواری بەلگەی مێژووییدا ئاماژەیان بوئەم سەرچاوەگرنگە کردووە . هەر لەبەر ئەم گرنگی پێدانەش بووە، ئەم کتێبە، لەسالی - 1961 ز - دا لەسەر پێسپێری سەرکردایەتی ئەوسای پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق - دووبارە تەقەللای لەچاپدانی درایەوە، (پیروت - مام جلال ) پێشەکییەکی تێروتەسەلی لە - 52 -لاپەڕەدا بۆ نووسیوە، بەلام لە رەقابە، ناونیشانە سەرەکییەکەی : کێشەی کورد - ی لەسەرهەلگیرابوو جگەلەمەش لەوکاتانەدا کەکتێبەکە خەریک بووە چاپی تەواوبێ، دەزگا پۆلیسیەکانی ئەوسای عێراق، هەرلە چاپخانەدا بۆشێجگاری دەستیان بەسەردا گرتبوو،بەلام نووسخەیەکیان، بەبێ دەرزی لێدان، لای بەڕێز - مام جەلال - پارێزرابوو، ئەم نوسخەیەش لەبەرئەوەی دەستاودمست و، جێگا گۆرکێی زۆر پێکرابوو، چەند لاپەڕەیەکی فەوتابوو..من هەولم دا ئەو چەند لاپەڕەکەمەی لەکتێبخانەکانی شارەکانەوە،لەچاپی یەکەمی کتێبەکەوە، پەیدا بکەمەوە، بەئومێدی ئاگاداربوونی خوێنەواران و نەوەی نوێ، لەباری سەردەمێکی خوێناوی پارچەیەکی نیشتمانەکەم، - ئەسلی کتێبەکە - بکەم بەکوردی و، بۆزیاتریش کەلک بەخشین بە خوێنەواران، هەندێ پەراوێزم بۆ زیادکردووەو، لەهەندێ جێگا شدا جارجارە وردەسەرنج و راستکردنەوەم لەسەر دەربڕیوە . . جگەلەمەش بە پێویستم زانی یاداشتەکەی - شەریف پاشا - ی نوێنەری کورد بۆ کۆنگرەی - سیڤەر - لەپاریس بکەم بەکوردی و، بیکەم بەپاشکۆی کتێبەکە چونکە لەدووتوێی کتێبەکەدا زۆرباسی ئەو یاداشتەکراوە، جگەلەوە کتێبەکەش و یاداشتەکەش هەردووکیان، بۆیەکەمین جارەکتێبخانەی کوردی، چاوی پێیان ئەکەوێ .

لەخوێندنەوەی ئەم کتێبەدا، هەست بەدلگەرمی وزامێکی کاریگەری تازەو، هاوارێکی بەرز ئەکەیت، بەرامبەر ئەوزولم و کوشتار و درندایەتیەی لەگەل کوردەکانی تورکیادا کراوە، دیارەکاتی چاپ و بلاوکردنەوەیشی، لەچاوئێستادا لەزور ڕووەوە - جیاوازتربووە، لەبەر

ئه‌وه‌ خوێنه‌ر هه‌ست ئه‌كات نووسه‌رانی ئه‌م كتێبه‌ ، به‌وها وازه‌ به‌رزه‌وه‌ ، به‌وله‌شه‌ خوێناوییه‌وه‌ ، به‌وهه‌موو زامه‌وه‌ ، به‌هه‌موو پاشقول لێگرتن و ده‌ست برین و په‌یمانه‌ دڕۆیانه‌وه‌ ، كه‌ - كه‌مالی - یه‌كان پێیان داون ، زور دلگه‌رمانه‌ وه‌ك تازه‌ جه‌رگ سووتاو ، تازه‌ جه‌سته‌ ئه‌نجن ئه‌نجن كراو ، قسه‌ ئه‌كه‌ن و ، به‌گیانێكی توندی نه‌ته‌وایه‌تیه‌وه‌ ، به‌رامبه‌ر به‌هه‌موو نه‌ته‌وه‌ی تورك ده‌ست دائه‌گرن ... من پێم وایه‌ - هه‌ندی جار - ئه‌و دلگه‌رمیه‌ كاتیانه‌ ره‌وایه‌ ، به‌لام زولم وسته‌م ودرندایه‌تی و فاشــیزمیتی هیچ رژێمێكی داگیركاری كوردستانیش ، تاوێنـــه‌ و ره‌نگـدانــــه‌وه‌ی نه‌ته‌وه‌كانیان نین ، چونكه‌ هه‌رله‌ناو نه‌ته‌وه‌ی تورك دا ، ده‌یــــان تێكوشه‌ری وه‌ك - ئیسماعیل بێشكچی - هه‌ن ، كه‌ دلسوزانه‌ داكوكی لـــه‌ مافی ره‌وای ئێمه‌ ئه‌كه‌ن و ، له‌پێناویا ئازار ئه‌كێشن . لـه‌بـه‌ر ئــه‌وه‌ هه‌لوێستی خوێنده‌واری هوشیار و دوربین ، له‌وكاتانه‌دا كـه‌ لـه‌گـه‌ل فاشیزمدا ئه‌جه‌نگن، یان له‌سه‌رده‌می درندایه‌تی ئه‌و رژێمانه‌دا ئه‌ژین ، له‌وه‌دایه‌ دووربینانه‌ سه‌یری مه‌سه‌له‌كه‌ بكه‌ن و ، وه‌ك كورد ئه‌لێ : دۆ و دۆشاو تێكه‌ل نه‌كه‌ین ، ئه‌بێ روونا كبیری كورد دلـنیــابـی كـــه‌ داگیركارانی كوردستان ، نوێنه‌ری راســـته‌قینـه‌و ، هه‌لبژێردراوی ، نه‌ته‌وه‌كانیان نین و ، نه‌ته‌وه‌كانیشیان سه‌رومڕ دوژمنمـان نـین ، بـه‌ پیچه‌وانه‌وه‌ ئه‌بێ دوستایه‌تی ئه‌وانیش فه‌راموش نه‌كه‌ین ، چـونكـه‌ ئه‌گه‌ر ئه‌و لایه‌نه‌ فه‌راموش بكه‌ین ، ئه‌وا ئه‌و به‌رنامه‌ دۆزه‌خ ئاسایه‌ی رژێمه‌كه‌ دێته‌ ئه‌نجامدان ، كه‌مه‌به‌ستێتی ، به‌وه‌ی نه‌ك هـــه‌ر دام و ده‌زگاكانی رژێمه‌كه‌ی ، به‌لكو سه‌رتاپای نه‌ته‌وه‌كه‌یشی بكات به‌گژمانـدا ئێمه‌ش به‌هه‌موو توانامانه‌وه‌و ، له‌هه‌موو روویه‌كه‌وه‌ دوژمـنـایـه‌تـــی رژێمه‌كه‌ش و نه‌ته‌وه‌كه‌یشی بكه‌ین ، له‌یه‌ك كاتدا ،كه‌ئه‌مه‌ش ئـه‌ركـی شۆڕشگێرانی كورد ، ده‌یان جار گرانترئه‌كات ،له‌كاتێكدا چاكتر وایــــه‌ ته‌قه‌للا بده‌ین به‌هه‌موو شیوه‌یه‌ك قه‌واره‌و هێزی ئه‌و دوژمنه‌ كه‌متر و ، كه‌متر بكه‌ینه‌وه‌ دیاره‌ ئه‌گه‌ر بتوانین نه‌ته‌وه‌ دراوسێكانی خـۆمــــان والێ بكه‌ین دۆستایه‌تیمان فه‌راموش نه‌كه‌ن ، ئه‌وا كـاتـێ رژێمـــه‌ داگیركاره‌كانیان شه‌ڕمان له‌گه‌ل ئه‌كه‌ن ، هه‌ربه‌ته‌نیا دام‌وده‌زگاكـانی

رژێمەکە شەڕمان ئەکەن . بێگومانیش لە زۆر هەڵکەوتی مێژوویـــــدا ، لە شۆڕشەکانی کورد دا گەلان وکەسانی تازا دیخوازو دراوسێمان ،یارمەتی وپشتگیریان کردووین ، وەک لە شۆڕشەکەی ساڵی - 1880 ز - ی شـــێخ عبیداللەی نەهری - دا ، کە زیاتر لە ( 5000) عـــەرەب و ، هـــەزاران ئەرمەنی و دیانەبەشداری شۆڕشەکەیان کردووەو ، گەلێ جاری تـــریش رووناکبیرانی ئەو نەتەوە دراوسێیانە ، لە ئەنجامی پشتگ ىمانیدا ،لـــە لایەن رژێمەکانیانەوە گیراون و ، ئازاردراون و،هەندێ جاریش کوژراون ..

هەرلە پاڵ ئەمەشدا هەمیشە دوژمنانی ئێمەویستوویانە ئەو تاوەڕۆکی مرۆڤایەتیەی لە دێرزەمانەوە لە بزووتنەوەی رزگاری خـــوازانــــــــەی گەلەکەماندایە ، ئاوەژووی بکەنەوە ، یان لە بیرمانی بەرنەوە ، بـــەوەی لەکاتی زەبروزەنگ پیشاندان و دەست لێوەشاندنی کوشندەدا ،لەلایەن دوژمنەکانمانەوە بۆسەر جەماوەرو گوندو شاری ئێمە ،وابکەن ئێـــمەش بخەنە هەمان هەڵوێستی بەرپەچدانەوە ، کە ئەمە یـــان هـــەرگـــیز لـــە بزووتنەوەکانی ئێمەدا نەبووە ، چونکە رووی نەداوەلە ئەنجامی سوتاندن یان کوشتن و گرتنی رەشۆکیانەی جەماوەری بێلایەنی ئـــێـــمەدا ، شۆڕشگێڕانی کورد بچن لە سەرجادەو ، گوندو شاری نەتەوە دراوســـێ نشینەکانماندا گوندەکانیان بسووتێننەوە ، یان هاو وڵاتیان بکـــوژن و بگرن ، مەگەر ئەوکاتانە بێ ، وەک نووسەرێکی گەورەمان ئەڵێت : (کە داگیرکەران خۆیان هاتبنە بەر کوتەکی کورد ) . کەچی ئەم هاوکیشەیە ، هەمیشە بەپێچەوانەوە بووە ، وەک لەم کتێبەدا ئەم دیاردە فاشـــیانـــەی رژێمی تورکیا لەساڵی (١٩٢٥-١٩٣٠ ز ) دا ، زیاد لە هەزار گوندیـــان سووتاندووە هەزاران هاو وڵاتی کوردیان کوشتووەو، ئاوارەو دەربەدەرو، بەزۆر گواستۆتەوە . ئەوەی لە وسەرنەمەدا رژێمی فاشی تورکیا لـــەگەڵ گەلی کورد دا کردوویەتی ، هەمان ئەوبەرنامە فاشی ورەگەزپەرستانەیە کە رژێمی فاشی بەغدا - ی ئێستا ، پەنجا ساڵ دواتر، واتە دوای هەرەسە رەش و تاڵەکەی ساڵی (١٩٧٥) بەهەمان شێوەو توندتر ، لـــەگـــەڵ گوندو شارو جەماوەری کورد دا کردی .

ئه‌مه‌ش به‌ڵگه‌یه‌کی زیندووه‌ بۆئه‌وه‌ی بڵێین له‌ هه‌موو سه‌رده‌م و جێگایه‌کدا فاشسته‌ و له‌ژێر هه‌رپه‌رده‌ونا وێکیشدا بێ به‌کا کڵه هه‌ر ئه‌وگیایه‌ن ، که‌له‌سه‌ر بنجی یه‌کتره‌ ڕوێنه‌وه‌ و،هه‌رئه‌ودڕندایه‌تیه‌شن که‌له‌ مانای بێمروه‌تی و، دڕندایه‌تی زیاتر، هیچ له‌مه‌سه‌له‌ی بزوتنه‌وه‌ی رزگاریخوازانه‌ی گه‌له‌که‌مان ناگۆڕن ، چونکه‌ نه‌له‌دوای ساڵانی (١٩٣٠) توانرا به‌وکاره‌ فاشیانه‌ کورد ، له‌کوردستانی تورکیا قه‌لاچۆبکه‌ن و، نه‌ دوای ساڵی (١٩٧٥) یش ، له‌عێراقدا توانیان کوردو بزووتنه‌وه‌که‌ی سه‌رکوت بکه‌ن .

له‌وه‌رگێڕانی ئه‌م کتێبه‌دا پێویستم به‌یارمه‌تی گه‌لێ ئه‌دیب وهاورێی شاخ وشاره‌کان هه‌بووه‌و، دڵسۆزانه‌ به‌ده‌نگمه‌وه‌ هاتوون . بۆیه‌ پڕبه‌دڵ سوپاسیان ئه‌که‌م ، به‌تایبه‌تی سوپاسی کاکه‌ (شه‌ریف) ئه‌که‌م له‌ که‌رکووک که‌ئه‌رکی زۆر بۆکێشاوم و، نوسخه‌ ئه‌سڵیه‌که‌ی بۆپه‌یدا کردم ، هه‌روه‌ها سوپاسی کاکه‌فه‌رهاد ئه‌که‌م له‌سلێمانی که‌ئه‌ویش درێغی نه‌کرد . سوپاسی برایانیش دکتۆرخدرو دکتۆر فوئادمه‌عصوم ئه‌که‌م ، که‌ هه‌ریه‌که‌یان به‌گوێره‌ی پێویست یارمه‌تیان دام .

— — — — — —

# جوگرافیای کوردستان

## سروشت و ئاو وهەوا :

کوردستا ن ، لە با کووری خۆرهە لاتە وە ،لە زە ریا چە ی ـ ورمێ ـ وە دە ست پێ ئەکا ت ، تا لای ـ مە لاتیە ـ لە با شوورو خۆرئا وا و ، درێژا یی ئەگا تــە نزیکە ی (٩٠٠) نۆسە دکیلۆمە تر و ، پا نا ییشی لە نێـــوا ن (١٠٠ـ ٢٠٠) کیلومە تردا یە ، ولاتێکی شا خا وییە و ، ئەکە وێتە نێوا ن هێلی (٣٤ـ و ـ ٣٩)ی پا نا یی و ، نێوا ن (٣٧ـ و ـ ٤٦) ی درێژا یە ، .[1]

کوردستا ن لە هە موو لایە کیە وە کێوی سە خت دە وری دا وە ، جگە لـــە بە شی با شووری خۆرئا وا ی ، چونکە ئە م بە شە ی بریتیە لە هە ردە وبا ن و دە شت ، کە ئا وی کا نی ی و رووبا ر پا را وی ئەکە ن چـا کترین نـا وچە ی بە کەلکیشی بۆ کشت وکا ڵ ، بە شی با شوور و ، با شووری خۆرهە لا تێتــی ، لە بە رئە وە ی رووبا ری ـ خا پوور ـ لە م بە شە یدا ن .

بە رزترین کێوە کا نی کوردستا ن ، ئە وا نە ن کە کە وتونە تە خۆرهە لاتیـە وە و ، هە موویا ن لێرە وا روو نزا ری چڕو دە وڵە مە ند دا پۆشیون ، دۆڵـــی بە پیتیش دە وری دا ون ، بویە هە میشە لە ها وین و، لە زسـتا نیشـــدا ، ئا وە دا نیا ن تیا یە و ، پڕن لە دێها ت وشا رو ، بە پێچە وا نە ی زنجـــیرە ی کێوە کا نی سە رکە وشە نی تورکیا و ، ئێرا نە وە کە رووتە نن و، لێـــرە وا ر و ، لە وە ڕیا ن تیا نییە ، چونکە لە گا شە بە ردی رە قە نی کا نزا یی شە قا رشە قا ر و دۆڵی زور لێژ پێکها توون ، لە بە رئە وە بە هێزترین ، ئا زا ترین ســوپـا نا توا نێ بە م نا وچە شا خا وییە دا رە ت بێ .

لە گە ڵ ئە مە شدا سە رچا وە ی زۆربە ی ئا و و رووبا رە کا نی لە م بە شـا نە وە هە ڵئە قوڵێن ، وە ک ـ فورا ت ـ وهە ، دوولقە کە ی و ـ دیجلە ـ ولقە کا نیشی.

---

1ـ بە رگی چوا رە می ـ دە وڵە تی عوسما نی ، لە نووسینی ـ ها مە ر ـ لە تە رجە مە تورکیە کە یە وە .

ئه م ئاوانه ش هه موویان رووله باشوورن ، جگه له ـقتور ـ نه بیّ ، کـه لقێکی رووباری ـ که ر ـ ه و، ئه ڕژێته زه ریای ـ قه زوین ـه وه ، هه نـدیّ چه م و رووباری تریش هه ن ، زوربه یان ئه ڕژێنه زه ریاچـه ی ـوان ـی به ناوبانگه وه ، هه ندێکی تریشیان ئه ڕژێنه زه ریاچه ی ـ ورمیّ ـ وه ، کـه له ولآتی عه جه م دا یه و ، که وتۆته لای خۆرهه لآتی زه ریاچه ی یه که میانه وه.

## کشـــت وکـالّ:

سه رباره ی ئه وه ش کوردستان وه ک به وه به ناوبانگه ، کـه ولآتێکـــی شاخاوییه ، به لآم له راستی‌دا و، به رله هه مووشتێک زۆربه ی‌ناوچـه کانی کشت وکالّی تیا ئه کریّ ، به تایبه تی ئه وناوچانه ی ئاووهه وایان مـا م ناوه ندی وسازگاره ، پرن له باخ وره زو هه مه جۆر دره ختی به رداروو، باخی سه وزه و، دره ختی ـ توو ـ که یارمه تی پێشخستنی هونـه ری پـــه روه رده کردنی کرمی ئاوریشم و، هه نگ ئه ده ن .

له زۆربه ی ناوچه کانی کوردستاندا وه ک ـدیاربه کر ـ و ـ ماردین ـ و ـ سه عرت ـ دۆشاوی تریّ دروست ئه که ن ، هه روه هـــا لـه کانـزا شـــدا ده وله مه نده .

له کوردستاندا به روبومی کشت وکالّی ی به هه موو جۆره کانیه وه زۆره و ، گرنگترینی جۆره کانی به روبومی خاکه که شـی ئه مانه ن :

گه نم و جۆ و گه نمه شامی ـبه هه ردوو جۆره که یه وه ـ و ، هـه رزن لـــه باشترین جۆری و، که تان و، پێسته و کونجی و لۆکه و، بنه به له ک و، مازوو و، پیازو ، سیبیرو، نیسک و ، فاسۆلیاو ، نۆک و، بادام و، گوێزو، باقلـه و ، هه نجیر ونبه ق و، زه یتوون و، سێو و، هه رمیّ و، قه یسی و، خۆخ و ، هه لّووژه و، گێلاس و، هه نار و، تریّ ـ به هه موو جۆره کانیه وه ، توو ، وه گه لیّ شتی تر له میوه و به روبومی تایبه ت به و ولآتانه ی که ئاووهه وایان مام ناوه ندیه .

## کان و کانزا :

لە ـ ئورفەلی ـ کانێکی گەورەی ـ مس ـ هەیە ، ناوبانگێکی گەورەی جیهانی هەیە . لەشاری بالو ـ ش کانێکی تیکەڵی مس و زیو هەیە ، لە ـ سیلوان و جەزیرەی ئیبن عومەر ـ کانی خەڵووزی بەردین هەیە ، لە هەندی مەڵبەندی شاری ـ دیاربەکر ـ یش کانی ـزیرو زیو ـ هەیەو ، لە قەزای ـ نیرۆخ ـ یش کانی ـ زێڕ ـ هەیە ، لەپاڵ ـ وان ـ و دەوروبەریشیدا ، کانی دەوڵەمەندی خەڵووزو قوڕقوشم و ، مس و ، فافۆن و نەوت وتەباشیر و ، چیمەنتۆ هەیە ، لەنزیک شارەکانی ـ ئەرجیش ـ و ـ چۆلەمێرگ ـ ئاوی مەعدەنی گۆگردەهەیە ، لەنزیک ـ باشقەلعە ـش ئاوی مەعدەنی ئاسن و، لەشاری ـ کەماخ ـیش کانی خەڵووزی بەردین وقوڕقوشم هەیە ، لەدۆڵی ـ زێ ـ دا ئاوی مەعدەنی ی کاربۆنی هەیە ، لەقەزای ـ کیفی ـ ش کانی ئاسن و، لەقەزای ـ کەسکیم ـ ش کانی ئاسن و پۆلا هەیە ، لەقەزای ـ خەنس ـ یش کانگەی نەوت و، قیبر و ، گەچۆڕ و، تەباشیر و ، شتی تریش هەیە ، لە ـئەرزیخان ـو ـباسیلی ـش تەباشیر و گەچۆڕ هەیە ، لەنزیک ـ ئەرزیخان ـ و چیای ئاگری داخ ـیش جۆرەها چاوگەی ئاوی گەرمی مەعدەنی ی هەیە ، لەمەڵبەندی ـ کەبان مەعدەن ـ یش ، لەپارێزگەی ـ خەربوت ـ کانی قوڕقوشم هەیە و ، لە ـ جەمشکزک ـ یش خەڵووزی بەردین و، لەوناوچەی ـ دەرسیم ـ یش چەند چاوگەیەکی ئاوی مەعدەنی هەیە ، نەجۆریان ئەزانرێ و،نەناویان.

## پیشەسازی :

لەخۆرهەڵاتی کوردستاندا ، پیشەسازی ـ بەرە ـ و ـ مافوور ـ زۆر پێشکەوتووە ، ئەم پیشەسازییە ، پیشەیەکی خۆماڵییەو، ئافرەتان لەکاتی دەست بەتاڵیدا ، شەوانی درێژی زستانی پێ ئەبەنەسەر . چنین ـ یش بەشێوەیەکی گشتی پێشکەوتووە ، ئەمەش ناوی ئەوکوتاڵ وکەل وپەلە مخوری و، لۆکەو ئاوریشمیانەیە کەتایبەتن بەکوردستانەوە :

هەمەجۆر پەرپەو خام وجیتی گوڵگوڵ وکەوا و مەباوڕایەخ و بەڕە و کلیم و پۆپەشمین وجاجم و تاقمی حەمام و ...[2]

هەروەها خۆشەکردنی پێستە و ، بەکارهێنانی بەهەمبوو جۆرێک پیشەیەکی بەربلاوە لەکوردستاندا ، زەڕەنگەری و، بەتایبەتی زێڕکاری کردنی چەکی بڕندەی وەکو مشتوی شمشێر وخەنجەر و دەمانچە لەسەر شێوەی کۆنی خۆرهەڵات و، دروست کردنی سینی زیو، بۆ بەکارهێنانی شەربەت وجگەرەو ، نەخشاندنی دەسکی سونگی و، بەکارهێنانی عاج و ئەبەنووس و کەهرەمانی زەرد و رەشیش[3] پیشەی جیاجیان لە کوردستاندا .

زین دوری و دارتاش - یش ، بەهەموو جۆرەکانیەوە ، تاڕادەیەک پێشکەوتووە ، شایانی باسە لەهەندێ ناوچەشدا شوێنی دروست کردنی سابوون و خومخانەو ، کارگەی تریش لەسەرشێوەی تازە هەیە ، لە - ماردین - یش‌دا جۆرە سابوونێکی چاک ودانسقە هەیە ، کەلە رۆنی فستق دروستی ئەکەن پێی ئەڵێن - بەتۆم -

<u>مەڕ و بزن و ولاخی بەرزە :</u>

ئەمەش ئامارێکی سامانداری ئەو مەڕومالاتەیە ، کە کوردستان ناوبانگی پێوەی پەیدا کردووە ، ژمارەیەکی زۆریان لێ ئەنێردرێتە دەرەوە بۆ ولاتە دراوسێکانی ، لەکوردستاندا ( 13 - 478 - 387 ) سەرمەڕ و ، ( 184 , 395 , 2 ) سەرگا و مانگا هەیە[4] .

---

2- لەگەڵ ئەم ناوانەدا هەندێ ناوی تر لەدەقە عەرەبیەکەدا بوون ، زۆرتە قەللای دۆزینەوە بانم داو قامووسیان بۆگەڕام و نیشانی گەلێ دۆستی عەرەبی زانیشم دان ، بەداخەوەمانا کانیانم نەزانی ، وەک وشەی : آلاجات ، الكزي ، الشتاري ، الشيلان و انواع التيل . ( م )

3- کەهرەمان : Sucin - کارەبا ، عەمبەر ، مووروری کارەبا ، زەردوویی ، مادەیەکی ڕەسەنی زەردی بەنرخە ، لەدرەختی کاژ دەرئەهێنرێ و بەکاری بالە پەستۆ- ئەبێت بەکارەبا لەژێرزەویدا (القاموس العلمي المصور - ص 78- بەرگی سێهەم - کەمال جەلال غەریب) - ( م )

4- بڕوانە - قاموس الاعلام - ی شەمسەدین سامی .

## سەرژمێری دانیشتوان :

بە هۆی نەبوونی هو و ، پێدا ویستی تەواوەوە بۆسەرژمێوکردنی تەواوی دانیشتوانی کوردستان ، ناتوانین رایەکی ئێجگاری دەربڕین . بەڵام بە هۆی وردبوونەوە لە تێکرای ئەو سەرژمێرە زۆر و خەملاندنە جیا جیانەی کە تائێستا لەم بارەیەوە دەرچوون ئەتوانین شتێک بڵێین لەراستییەوە نزیک بێت :

لە کتێبی زەرد دا ، کە سالّی - 1892ز - لە فەرەنسا دەرچووە ،ئەڵێت کوردەکانی تورکیا ژمارەیان - 879, 012, 3- کەسە .

ژەنرال - زلنجی - یش لە گەڵ سەرژمێرکردنی تورکیا دا ئەڵێ کوردی تورکیا ژمارەیان - 475, 800, 2- کەسە . لە سەرژمێری تریشدا کە حکومەتی تورکیا لە سالّی - 1919ز - دا بلاوی کردۆتەوە ، وا هاتووە کە لە ( 1914/3/1 ز - دا ) کورد، لەناوچەکانی -وان - و - بەدلیس - و - خەربووت - و - دیاربەکر - و - ئەرزەروم - دا ،ژمارەیان- 2,527,840- کەس و، ئەشڵێ ئەم سەرژمێرە بەشەکانی تری کوردستانی تیا نیە .

- مسیۆ ویتال کونیە - ش لە کتێبەکەیدا کە ناوی ناوە -ئاسیای تورکیا - و لە سالی 1892 ز - دا چاپ کراوە ، ژمارەی کوردی تورکیا بە - 1,928,550 - کەس دائەنرێ .

لە راپۆرتی ئەولیژنەیەشدا ، کە بە سەرۆکایەتی - کونت تلکر - ی سەرۆکی پێشووی وەزیرانی - هەنگاریا - ، لە سەر فەرمانی کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە پێک هاتبوو، وەلە 16 ی تەمووزی - 1925 ز - دا بلاو کراوەتەوە ، ئاوا هاتووە :

ژمارەی کورد لە تورکیادا - 1,500,000 - کەس و لە ئێران 700,000 کەس و لە عێراق 500,000 - کەس و ، ئەوانی تریشیان کەلە ولاتانی وەک : سوریا و هی‌تردا بلاون ، ژمارەیان- 300,000 - کەس ، بەمەش ژمارەی هەموویان ئەکاتە - 3,000,000- کەس .

گومان لەوەدا نیە کە هەموئەم خەملاندنانە دوورن لە راستی و دروستی‌یەوە ، چونکە مسیۆ ئەلکسەندەربابا - لە کتێبەکەیدا : کۆمەڵە

چیرۆک و تێبینی کوردی‌دا ، کە لە ساڵی ـ 1860 ، ز ـ دا لە ـ بطربیعسورغ ـ بڵاوبۆتەوە ئەڵێ : ژمارەی کورد بەسەرژمارکردنی ماڵ وچادرەکانیەوە ئەکرێ و ، ئەڵێ ژمارەی هەرماڵ و ، هەرچادرێک بریتیە لە نێوان ( 5 ـ تا 20 ) سەرخێزان .

ئێمە لێرەدا بەپێی ئەم بنەمایە هەوڵمان‌دا ،رابەک لەمەرسەرژمێری راستەقینەی کوردستان دەربرین و، لەنێوان هەردوو ژمارەی ( 5 ) و ( 20 ) دا ، ژمارەی ( 10 ) مان وەرگرت ، بەرانبەر ژمارەی‌خانووەکانی ناوشارەکان و، ژمارەی چادری رەوەندەکانمان وەرگرت وملێکمان دان ، ئەگەینە ئەمە :

| | |
|---|---|
| کوردستانی تورکیا | 3,987,960 |
| کوردستانی ئێران | 3,300,000 |
| کوردستانی عێراق | 749,380 |
| کوردستانی سوریا | 289,940 |
| لە کۆماری ئەرمینیا | 60,000 |
| هەمووی | 8,387,280 |

لەگەڵ ئەمەشدا ئەتوانرێ بوترێ کە ژمارەی تەواونزیک لە راستیەوە ، ژمارەی ( ٩ ) نۆملیۆنە ، چونکە ئەوژمارەیەی سەرەوە ، ئەو کوردانەی تیانیە ، کەلە ناوچەجیاجیاکانی دنیادا پەرش وبڵاون و،رەنگە ژمارەیان بگاتە ( ١ ) ملیۆن ، یان زیاتریش .

— — — — — —

# زمان وئەدەب

زمانی کوردی-ش وەک تێکڕای زمانە ئارییەکانی خۆرهەلات ، لە پەهلەوی وسەنسکریتی و، میدی جیا بۆتەوە ، ئەم زمانەش لە سەرەوە بەرەوڕاست و بە ڕێنووسێکی سەربەخۆ ئەنووسرا ، نزیکایەتی زۆری لەگەلّ ڕێنووسی ئاشوری و ئەرمەنی‌دا هەبووە ، ئەم ڕێنووسە وازی لێهێنرا و بەڕێنووسی عەرەبی کۆتایی پێ هێنرا کە زمانی قورئانی پیرۆزە .

زمانی ئێستای کوردی ئەبێ بەچوار شێوە زمانی جیا جیا وەکە ئەمانەن : کرمانج ، گۆران ، لوڕ و ، کەلهوڕی . لەناو ئەمانەشدا شێوە زمانی لوڕی لە هەموویان زیاتر لە پەهلەوییەوە نزیکە ، لەبەرئەوەی لوڕەکان لە مەڵبەندی پەهلەوییەوە نزیکن و، کلدنی وئاشورییەکان زۆر کاریان تێ نەکردوون .

دوای ئەم ، کەلهوڕی لێ‌ی نزیکەو ، ئینجا - گۆران - و پاشان کرمانج . بەلّام ئەم دووانەی دواییان زمانەکانی کلدانی و ئاشوری کاری تێ‌کردوون ، چونکە دراوسێتیان نزیکە .

بۆ روون کردنەوەی ئەم مەسەلە ئالۆزەش ، لێرەدا پوختەی ئەو نووسینە ئەخەینە بەرچاو ، کەخاوەنی جوگرافیای -ملطبرون - نزیکەی سەدسالێک لەمەوبەر لە بارەی روونکردنەوەی مانای وشەی - ئێران ، یران - وەک لە خۆرهەلّاتدا باوەو - ئێریانە ، ئاریانە - وە ، وەک لە خۆرئاوادا باوەو ، لەمەڕ گەشەکردنی زمانەکانی ئێرانیدا ، کەلە ناو نەتەوە پێشکەوتووەکانی ئێراندا نووسیوێتی و ئەلێ :

" پێشینەکان کاتی خۆی جیاوازیان لەنێوان - ئاری - وئەسقوثی (تاتار) دا ، داەنا ، هەروەها جیاوازیان لەنێوان هەردوو وشەی (توران) و - ئێران - دا ، دائەنا ، کەلەسەر خانووبەرەکانی -ئەصطخر- وشەی - ئاریانە - نووسراوە و ، هەرهەمان ناوی -ئاریانە- کە لای یۆنانیەکان باوبووە ، بەلّام هەندێ زانای - یۆنان - ئەم زاراوەیەیان هەربۆ خۆرهەلّاتی ئێستای ئێران - خۆراسان وئەفغان - بەکارهێناوە

کەچی ـ هیرۆدۆت ـ زاراوەی ـ ئێران ـ ی بەتێکڕای ئەو وڵاتانە وتـووە کە کەوتۆتە نێوان خۆرهەڵات وخۆرئاوای ـ دیجلەو فورات ـەوە چونکە گومانی تێدانیە کە ـ میدیا ـ ییەکانیش هەر پێیان ئەوترا : ـ ئاری ـ .

کۆنترین زمانی ـ ئاریانە ـ ش ، هەردووزمانـــی ـ زەنـــد ـ و ـ پەهلەوانە ـ زمانی ـ زەندی ـ ش کاتی خۆی زمانی کتێبی ئـاییـنـی ئێرانی کۆن بووە ، کەپێیان وتووە ـ زەند ئاوێستا ـ چونکە ئەم زمـانـە لەسەرتاپای ناوچەکانی باکووردا ، لەبانی ئێراندا هەر لەخـۆرئـاوای ـ بوخارا ـ وە ، تا ئەزرنجان باو بووە ، ئەم زمانە تائەم چەنـدانـەی دواییش لای ـ مەجوسەکان ـ هەرپیرۆز بووە ، وەک چـۆن زمـانـی ـ سەنسکریتی ـ لای زاناکانی هیند پیرۆزە . ئەمەش ئەوە ئەسەلمێنێ کەئەم دوو زمانەکۆنە لەبنچینەدا هاوبەشێتێکیان لەنێواندا هەیە .

بەڵام زمانی ـ پەهلەوی ـ بەواتا زمانی ـ پاڵەوان و جەنگاوەران ـ وادیارە کاتی خۆی لەعێراقی عەجەمی و، میدیای گەورەو ـ برث ـ یشـدا (واتە هەرێمی فارس) دا بەکارهاتووە ، هەندێکیش پێی وایەکاتی‌خۆی ئەم زمانە ، تاقەزمانێک بووە کەلە کۆشک وسەراودیوەخانی پاشاکانی ـ قیروس ـ نەژاددا ، بەکارهاتووە ، کەواتە بەهـۆی نـزیکایـەتـی‌و بەکارهێنانیەوە لەلایەن پاشاکانەوە ، وشەگەلێکی زوری کلدانی‌وئاشوری تیایەو، جگەلەمەش کاتی خۆی کتێبە ـ مەجوس ـ یەکان لـە زمـانـی ـ زەند ـ یەوە وەرگێڕدراونەتە سـەر پەهلەوی .

دیسان هەربەم زمانە نووسینی هەڵکۆڵراوی زۆری سەردەمی ساسانی هەیەو، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەئەم زمانە لەسەردەمی ئەمانیشـدا ، بەکارهاتووە ، بەڵام وردە وردەلەسەرەتای سالی ـ ٢١١ ز ـ یەوە ، بـۆ سالی ـ ٦٣٢ ز ـ زمانی پەهلەوی ـ یانەیان کەلاخـســـتووە ، کـەلـە باپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوەو، چوونەتەکێوی ـ برثە ـ و ، بەپـــێی فرمانی شاهانەویاسای بڵاوکراوە ، زمانی فارسی ـ یان ، کەشێوەزمانـی هەرێمی فارسە ـ واتە ناوچەی ـ شیراز ـ ی ئێستایە ـ بەسـەرهەموو ئەو هەریمانەدا سەپاندووە ، کەلەوسەردەمەدا لەژێر رکێفی خۆیاندابووە ، هەربەراســتیش ئەمیان لەـ پەهلەوی ـ و ـ زەندی ـ ش ئاسانترە .

له سه ده ی حه وته می زاینیشدا ، کاتێ عه ره ب به ته واوی ده ستیان به سه ر ده وله تی فارس دا گرت ، ئیتر ئه م زمانه گه شه و شه وقی له ده ستدا له سالی ۹۷۷ ز یشدا و له سه رده می - دیالمه - دا ، کاتێ ویستیان زمانێک له زمانه کۆنه کانی ئێران زیندوو بکه نه وه ،که سیمای شارستانێتی پێوه دیار بێ ، هاتن زمانی فارسیان هه لبژارد، که نزیکتر بوو له سه رده می خۆیان و، له هه مان کاتیشدا تازه ش بوو ، به لام سه یریان کرد ئالوگۆڕی زۆری به سه ردا هاتووه و، گه لێ وشه ی عه ره بی و زمانی تری دراوسێ ی تێکه ل بووه ، له گه ل ئه مه شدا شاعیران و وتاربێژان له م زمانه و له زمانی تری ئێرانی کۆنی وه ک زه ندی و په هله وی کۆنی کوردی ، شێوه زمانێکی ئاسان و فره وشه و ، فره مانا و ، ئاخاوتن شیرینیان هه لبژارد و،ناویان نا ، زمانی فارسی تازه و ئێستا له ولاتی فارس دا باوه .

زمانی کۆنی فارسی - ش به هۆی کتێبی به ناوبانگی - شاهنامه ی فیرده وسی - و کتێبه مه جوسیه کان و کتێبی کۆن و پیاوانی - مه جوس - ه وه ، هه ر به پارێزراوی مایه وه.[1] "

له مه وه بۆمان ده رئه که وێ ، نه ته وه ی کورد له نه ته وه کۆنه ئێرانیه کان و ، بناغه ی شارستانێتی پێشکه وتووی له بانی گه وره ی ئێراندا دانا وه و ده سه لاتی له خۆرهه لاته وه ، هه ر له دۆلی - سه ند - ه وه تا ئاوه ڕۆی - دیجله وفورات - له خۆرئاوادا ، رۆیشتووه و، زمانه که یشی به ناوی زمانی - په هله وی - یان - په هله وان - به واتای زمانی پاله وانان و جه نگاوه رانه وه ، له تێکڕای ولاتانی سه ربه ئیمپراتۆریه تی یه که می ئێرانی باوبووه ، که ئه سکه نده ری مه کدونی له ناوی بردووه و،دوای ئه ویش به ماوه یه کی که م.، ده وله تی پاشایاتی -طوائف- دا زرا ، که له مێژووی فارس دا به ئه شکانی ناوئه برێن و، ئه مانه هه رئه وانه بوون که تا ماوه یه کی زۆر له سه ر ده ست به سه را گرتنی ئێران ، له شه ڕدا بوون ، تا یاشای هه رێمی فارس ، به سه ر هه موویاندا سه رکه وت و دووه مین

---

1- بڕوانه وتاری په نجاوپێنجه مینی هێلکاری ئاسیا ، وه رگیراو له جوگرافیای - ماظیرون - عه ره بی ، ل 121

ئیمپراتۆریەتی ئێرانی دامەزراند،کە پاشان ناونرا ـ ساسانی ـ وەوشەی ـ فارس ـ لەتەک وشەی ـ ئێران ـ دا بەهەموو ئیمپراتۆریەتی کۆن و نوێ ئەوترا ، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی یەکەمین ئیمپراتۆریەتی ئێرانیش هەربە فارسی ناوببرێ ، لەکاتێکدا کە کوردی پەهلەویش بووە ، چونکە سەرەرای ئەوەش کە نەتەوەی فارس ، لەشارستانیتی و سەروەری ی ئێراندا کۆنە ، بەڵام لەچاو نەتەوەی کورددا تازەترە . کورد لە پێش ئەودا بناغەی یەکەمین شارستانێتی ئێرانی دانا وە .

ئەمەو ، زۆربەی ئەدیبان وزانایانی‌کورد ، دوای ئیسلام ، بەرهەمی خۆیان لەبواری هونەرو زانستدا ، بەزمانی تری وەک فارسی و عەرەبی و ، لەم دواییەشدا بەتورکی نووسیوە . لەگەڵ ئەمەشدا ژمارەیەکیان زمانی نیشتمانی خۆیان ، هەر لەبەری هەست وبیری خۆیان لەیاد نەکردووەو ، کۆمەڵێ نووسراوی گەورەیان لە هەمەجۆر هونەرو زانستین دا بۆ بەجێ هێشتووین .

ئێمە لێرەدا ناوی ـ هەندێ ـ لەئەدیبانی ناودارییان بەسەر ئەکەینەوە ، کەبەزمانی کوردی نووسیویانە ، نەک هەموویان ، لەترسی ئەوەی درێژە بەباسەکە نەدەین ، چونکە باسکردنی یەک بەیەکیان ، پێویستی بەکتێبێکی سەربەخۆ هەیە :

عەلی حەریری : ساڵی ١٠٠٩ ز ـ لەشارۆچکەی ـحەریرـ سەربەهەولێر لەدایک بووەو ، دیوانێکی شیعری ئێجگار جوانی هەیە و ، هەر لە شارۆچکەکەی خۆی نێژراوە و ، گۆڕەکەی بۆتە مەزار .

مەلای جەزیری : ناوی ـ شیخ ئەحمەد ـ ەو ، بەم نازناوە بەناوبانگە ، خەڵکی بۆتانەو چامەی ناسکی لەغەزەل و خواپەرستی وتەسەوف دا هەیە و ، دیوانێکی شیعری هەیە ، کەلای خەلک زۆر خۆشەویستە وەساڵی 1160 ز[2] لەجزیرەی بۆتان ـ جزیرەی ئیبن عومەر ـ کۆچی دوایی کردووە و ، هەرلەوێ نێژراوەو ، گۆڕەکەی بۆتە مەزار .

---

2- رەنگە دانانی مێژووی زاییین لەپاڵ مێژووی ژیانی ئەم شاعیرەدا هەڵەی چاپ بێت ، چونکە ـ مەلای جەزیری ـ لەساڵی ـ 1407 ز ـ دا لەدایک بووە ، لەساڵی ـ 1481 ز ـ دا ، کۆچی دوایی کردووە ، لەبەرئەوە ئەگەرهەڵەی نووسەرنەبێ ، ئەوا مێژووی ـ کۆچی ـ یە ( م )

فەقێ تەیران : ناوی ـ مەحمود ـ ە و خەڵکی شارۆچکەی ـ مەکس ـ ە و ساڵی ـ 1302 ز ـ[3] لە دایک بووە ، دووکۆمەڵە شیعری گەورەی هەیە بە ناوی ـ شیخی سەنعانی ـ و چیرۆکەکانی ـ بەرسیسا ـ و دیوانێکی بە ناوبانگیشی هەیە، بە ناوی ـ وشەکانی ئەسپە ڕەش ـ ەوە ـ ئەسپەکەی پیغەمبەر (د . خ) کە بە بوراق بە ناوبانگە ـ ئەم نووسراوەیان لە ناو خەڵکدا زۆر بڵاوە ، کتێبێکی تری شیعری هەیە بە ناوی (م . هـ) دەربارەی تەسەوف و ـ وحدە الوجود ـ ە . ساڵی ـ 1376 ز ـ لە شارۆچکەی ـ مەکس ـ کۆچی دوایی کردووە و، هەر لەوێش نێژراوە .

مەلای باطی : ناوی مەلا ئەحمەدە و، بەوبۆنەیەوە کە لە گوندی ـ باطە ـ ی لای ـ هەکاری ـ بووە ، بە ـ باطی ـ بە ناوبانگە. ساڵی 1417 ز لە دایک بووە ، دانراوێکی دەربارەی چیرۆکی لە دایک بوونی پیغەمبەر (د . خ) هەیە و ، دیوانێکی شیعریشی هەیە . ساڵی 1492 ز کۆچی دوایی کردووە .

ئەحمەدی خانی : شێخ وزانایەکی پایە بەرز و ، شاعیر و عاشقێکی پرشنگدارە و ، لە هۆزی ـ خانیان ـ ە و ، خاوەنی دیوانی ـ مەم وزین ـ ی بە ناوبانگە ، کە چیرۆکە شیعرێکی بێ وێنەیە ، وەک ـ ئەلیازە ـ ی هۆمیرۆس. ئەم کتێبە لە ساڵی 1591 ز[4] لە ـ بایەزید ـ نووسراوە . فەرهەنگێکی لە بارەی زمانی عەرەبی و کوردییەوە نووسیوە ، ناوی ـ نەوبەهارە ـ گەلێ کتێبی تریشی بە عەرەبی و تورکی هەیە و، جگە لە شیعر، بەهرەیەکی گەورەشی لە هونەرە جوانەکاندا هەبووە ، ساڵی ـ 1652 ـ ز کۆچی دوایی کردووە و ، لە تەنیشت ئەومزگەوتەدا نێژراوە کە خۆی لە شاری بایەزید دروستی کردووە .

ئیسماعیل : خەڵکی ـ بایەزید ـ ە و ساڵی 1654 ز لە دایک بووە ، ئەمیش هەر شاعیری غەزەلە و، لە نووسینی چیرۆکە شیعریشدا چاوی لە

---

3- ئەمیش لە کۆتایی سەدەی شانزەهەمی زاییندا ژیاوە (م)

4- ئەم مێژووەش هەرهەڵەیە ، چونکە ئەحمەدی خانی ساڵی ـ 1650 ز ـ لە دایک بووە و ، ساڵی ـ ١٨٠٧ ز ـ کۆچی دوایی کردووە . بۆزیاتر زانین لەم بارەیەوە بڕوانە ( ئەحمەدی خانی شاعراً و مُفکراً ، فیلسوفاً ومتصوفاً ـ الدکتور ـ عزالدین مصطفی رسول ـ بغداد ـ ١٩٧٩ ـ ) ـ (م)

ـ ئەحمەدی خانی ـ کورد کردووە ، کە ـ هۆمیرۆس ـ ی کـــوردە و ، ـ فیردەوسی ـ فارسە . فەرهەنگێکیشی بۆزمانی کوردی وفارسی و عەرەبی نووسیوە و، ناوی ناوە ـ گوڵعوزار ـ ، گەلێ چامەوشیعری ناسکیشــی هەیە ، کە بەشێوەی کرمانجی ژووروو نووسیویێتی ، ساڵی 1709 ز لـــە بایەزید ـ کۆچی دوایی کردووە و گۆڕەبەتاوبانگەکەشی هەرلەوێیە .

شەریف خان : ناوی ـ میرشەرەف خان ـ ەو ، لەمیرەکانی هەکارەو ساڵی 1686 ز لەشاری ـ چۆڵەمێرگ ـ ی مەڵبەندی هەکاری لەدایــک بووە و، گەلێ یادگاری پەخشان وشیعری هەیە و ، دیوانێکی ئێجگـــار جوانی هەیە ، شیعری بەفارسیش نووسیووە ، سالی 1748 ز کۆچی‌دوایی کردووە و هەرلە چۆڵەمێرگ نێژراوە .

مرادخان : خەڵکی بایەزیدە و لەساڵی 1737 ز لـەدایـک بــووە و ، بەرهەمێکی زۆری نووسراو وشیعری جوانی دەربارەی تەسەوف وغـــەزەل هەیە ، ساڵی 1784 ز کۆچی دوایی کردووە .

عەلی تەرموکی : یەکێکە لەزانا پایەبڵندو مامۆستا مەزنەکان ساڵی ـ 1000 ـ کۆچی لەگوندەکەی خۆیدا کەکەوتۆتە نێوان هـــەکـــاری و مەکس ـ ەوە لەدایک بووە ، دەستێکی بالای لەزانســـت و هـــونـــەر و بەتایبەتیش لەهونەرەجوانەکان و، دەرس وتنەوەدا هەبووە . دانـــەری کتێبی رێزمانی کوردیشـــە ، گەشتی بەکەڵکی بۆ وڵاتە دراوسێکان کردووە و تیایاندا گەلێ شتی بەکەڵک و سەرنجی تیژی تۆمارکردووە ،گۆڕەکەیشـی هەرلەگوندەکەی خۆیدایە .

مەلایونسی هەلەکاتینی : خاوەنی سێ‌نامەبەناوبانگەکوردییەکەیە ، کەلەکوردستاندا بەناوبانگەو، دەربارەی فێرکردنی زمانی عەرەبییە لـــە ـ تصریف و، ظروف و، ترکیب ـ دا . گۆڕەکەیشی لـــە گـــونـــدی ـ هەلەکاتین ـ ە کەتیایدا لەدایک بووە .

— — — — — — — —

## ـ کورد و خزمەتی بە شارستانێتی ئیسلام و کولتووری عەرەبی گەیاندووە

کەسانێکی کەم ئاگاداری ئەوخزمەتە گەورەو گرانەن ،کەگەلی کورد میران و سەرکردەو، زانایانی ، لە هەمە جۆر سەردەمی مێژووییـدا لە پێناوی بەرگری لە شارستانێتی ئیسلام وکەلتووری عەرەبی‌دا کردوویانە .

ئەوەیشی بە وردی سەرنجێک بداتە کتێبە کۆنە مێژووییەکانی و بەتایبەتی کتێبە تەرجەمەکراوەکانی ، کەپڕن لەرووداوی سیاسی و جەنگی وسەربازی ، ئەمانیش لەلایەنی کۆمەڵایەتی و، رەوتی زانستی و هونەر ، بەڵگەی زۆرئەبینێ ، کەکورد لەسەرەتای پەیدا بوونی شارستانێتی ئیسلام و، دوای ئەویش لەدەورانی تری جیا جیادا ، بەشداریەکی چەندئاشکرای لەزۆربەی لایەنەکانی ژیانی کومەلایەتی و سیاسی و زانستی‌دا کردووە .

لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نیە ، تا بەتێروتەسەلی دەربارەیـان بنوسین ،کە لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عـەباسیـ‌دا ، چ دەورێکیان بووە ، چونکە هـێزی کاریگـەربوون لەولاتی‌فارس‌وعێراقیشدا ، بەلگو هەرئەوەندە باس ئەکەین کە ـ ئەبوموسلیمی خۆراسانی-پێشەواو دامەزرێنەری گەورەی دەوڵەتی عەباسییە ولەپیاوانی بەناوبانگی کوردەو گومانیشی تێدانیە کەتوانای ئەم ، وای کرد روخساری دەوڵەتلە ئیسلامدا بگۆڕدرێ و، بنچینەی چەرخی زێڕین وزانست و پێشکەوتن دابمەزرێ .

دوای ئەمیش میرئەحمەدی کوڕی مەروانی کوردی ـدێت کەدامەزرێنەری میرنشینی مەروانی کوردی‌یە ، لە ـ میافارقین ـ و ـ دیاربەکر ـ.ئەمیش بەرگریەکی باشی لەدەسەڵاتی خولەفاکان و، بەربەرەکانـێیەکی زۆری ـ غولمان تورک ـ ی کردووە ، خزمەتەکەیشی بەجۆرێک لەبەرچاو گیراوە کە ـ ئەلقادربیللا ـی خەلیفەی عەباسی و هاوەدردی یەکتر ، نازناوی

ـ نصرالدوله ـ ی داوەتێ و، متمانەی خۆی پێ بەخشیوە ، ئەم میرە و جێگرەکانی دوای خۆیشی ، یادگارێکی پڕشانازیان لە ـ دیاربەکر ـ و ـ میافارقین ـ و ـ ماردین ـ و شوێنی تردا بۆشارستانێتی ئیسلام بەجێ هێشتووە، مێژووش بێ ئاگا نەبووە لە ئامادەکردن و ناساندنی سەرداڕانی کورد، ئەوانەی لە هەمەجۆر بواری زانست و هونەری ئیسلامیدا بەرهەمیان بڵاوە ، هەرلە ـ فقەو ئوصول وتەوحیدو فەلسەفەومێژوو و وەرگێڕان و مەنطیق وحدیث ـ دا و، کتێبەکانیان لەقوتابخانەکانی بەغداو قاهیرەو مەککەومەدینەو،ئەسفەهان ومەراغەو ، بەتلیس و، دیمەشق و، حەڵەب وشارەزوور ـ هەرێمی ئێستای سلێمانی ـ و گەلێ پایتەختی تری ئیسلامی و، گەلێ دەورانی تردا ، ئەخوێندرا .

وڵاتی کوردستانیش ، لەسەردەمی عەباسیدا قەڵایەکی پتەو بووە بۆ پاراستنی خەلافەت ، چونکە کەوتبووە بەردەم تەوژم وشەپۆلی ئەوڕۆم ـ یانەی لەباکوورەوە بەدرێژایی رووباری ـ فورات ـ تا ئەوسەری خۆرئاوا لە ـ ئەلبیرە ( بیرەجەک ) لەگەڵ قەڵەمڕەوی وڵاتە ئسلامیەکاندا لێکیان ئەدایەوە و، ئەوسا بەشی خۆرئاوای وڵاتی کورد ، پێی ئەوترا : وڵاتی پڕلە کەلێن وکەلەبەر و، خەڵکی ناوچەکەو، موسڵمانی تریش بەرگریان تیا ئەکرد، بۆیە تا ئێستاش نیشتمانی کورد لەم سەریەوە ، تا ئەوسەری ، پڕێتی لە قەڵو سوپەرو، ئەگونجێ ئەگەر بەپێی زاراوەی تازە ناوی بنێین " قەڵای پێشەوەی ئیسلام " .

، سەربارى ئەمانەش ئەوخزمەتە زۆرەی دەوڵەتی ـ ئەیوبی ـ ی مەزن پێشکەشی کردووە ، کەسوڵتانی کۆچکردوو ـ سەلاح الدینی ئەیوبی[1] ـ بەهەشتی ـ دایمەزراندووەو، ئالای لەمیسرو شام و کوردستان وحیجازو یەمەن و ـ تەرابلس ـ ی خورئاوادا شەکاوەتەوە . مێژوونووسانی کۆن و تازەش ئەمەکی تەواوی ئەم دەوڵەتەیان ،لەهەردوو لایەنی سیاسی و جەنگیەوە داوەتەوەو ، ئەوەندەیان لەسەر نووسیوە ، کە لێرەدا پێویست ناکات ، ئێمە زیاتری لەسەربڕۆین .

---

1- سەلاحەدینی ئەیوبی لەساڵی ـ 1138ز ـ لەتکریت لەدایک بووەو، لەساڵی ـ ١١٩١ز ـ دا ،لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە ( م )

خوێنەریش ئەگەرئەم بەسەرکردنەوە کەمەی لەو خزمەتە زۆرەی کورددا لەبواری سیاسی و زانستی و، هەمەچەرخەی ئیسلامدا بەیاد کردەوە ، ئەوەیشی خستەپاڵ کەلەلاپەڕە جیاجیاکانی مێژووی ئیسلام و دەبگوباسیاندا نووسراوە ـ هەرچەندە هەندێک بەهەڵە داویانەتەپاڵ فارس ـ پێویست بەکتێبێکی گەورە ئەکات ، کەبەسەربەخۆ بنووسرێ .ئیتر ئەوکاتە ئەتوانێ بڕیاری خۆی بدا ، کەکورد تائەم سەردەمانەی دواییش کەوڵەکەیەکی بەهێزبوون لەدروست کردنی دەوڵەتی ئیسلام و، پێتێکەوەنانی شارستانێتی و بەربڵاوبوونی زانینەکاندا ، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێینەوە بۆئەو مەبەستەی ئەم باسەمان بەپەلە ، لەپێناویدا دانا ، ئەویش دەرخستنی ئێستای کوردبوو، لەژێر باری هەمەجۆرچەوساندنەوەی تورک دا ، کەبوتەمایەی بەرپابوونی زنجیرەشۆڕشێک لەچەندان ناوچەدا و ، ئەنجامیش لەداهاتوودا ، هەرئەبێ ئەم گەلەبەئازادی خۆی بگات .

پێشمان وایە پێش ئەوەی بچینەناو مێژووی تەواوی شۆڕشەکانیەوە ، دژی تورک ، باشتر وایە پێناسەیەکی رەوشت وخووی کورد باس بکەین ، بۆئەوەی خوێنەر ئاسانتر لەتەم ومژی ناکۆکی ـ کوردوتورک بگات و لەبەرئەوەش کەباسەکە دەربارەی گەلەکەمانە ، بەچاکمان زانی لەم بوارەدا گوێ لەوتەی ئەو بیانانە بگرین ، کەتوێژینەوەیان لەسەر کورد و کوردستان کردووە .

— — — — — — —

# چەردەیەک لە وتەی
# مێژوونووس و توێژەرەوە بیانەکان لەسەر کورد

مسیو ـ ئەلکساندەر یابا ـ لە کتێبەکەیدا: کۆمەڵە سەرنج وهەواڵێک دەربارەی کورد " کە ساڵی ـ ١٨٦٠ ز ـ بڵاوی کردۆتەوە، ئەڵێ :

" کاتێ خۆی لە نیشتمانی کورددا، ژمارەیەکی زۆر قوتابخانە هەبوون، زۆریش بە تەنگ فێربوونی زانینەوەن، چونکە لە هەموو شار و ناوچە، یان هەرگوندێکدا، لە وڵاتی کورددا قوتابخانەو دوو قوتابخانەو، سیان وهەندێ جاریش زیاترئە بینری ،کاربەدەستان وخەڵکەکەش زوربەپەروش و گرنگیەوە قوتابخانەو زانایان ئەپارێزن، گەورەو بچوکیان رێزی هونەر و زانست ئەگرن و ئەینرختێنن . مامۆستای زورباشیش لە ـ جزیرە ـ و ئامێدی و ـ سۆران ـ و ـ سیرت ـ و شوێنانی تر هەن،ئەوەیشی بیەوێ بروانامەی ـ لیسانس ـ وەربگرێ، ئەبێ لە قوتابخانەدا، دوانزە جۆر زانست فێرببێ، ئێستا قوتابخانەو مامۆستاو قوتابی، کەم بوونەتەوە، یان بەواتایەکی تر، هەرنەماون و زور دەگمەنن " .

مسیۆ ـ نیکتین ـ یش لە کتێبەکەیدا ـ وردبوونەوەلە کورد ـ ئەڵێ :

بۆ دەرخستنی رەوشتی ئەم گەلە، ئەبێ ئەوە بڵێین کە داوێن ـ پیسی لای کورد، هەر بەتەواوی شوێنەواری نیە ،لەبەرئەوە زاراوەیەکیان بەرانبەر بەم کارە نییەو، بۆئەمەش وشەی تورکی بەکارئەهێنن ،چونکە کورد، هەرکە بووە خاوەن خێزانی خۆی، ئیتر هەرئەو تاکە ئەهێنێ و، ژنەکەیشی لەژیانی ناوخۆی خێزاندا دەسەڵاتێکی گەورەی ئەبێ و، ماڵ بەرێوە ئەبات و نۆکەرو گزیریش بەگوێی ئەم ، ئەکەن ، هەر ئەمیش خۆراک لەسەرخوان دابەش ئەکات و، بەبێ فرمانی ئەم ، نان دانانرێ و ، کەمێردیشی لەماڵ نەبێ ، پێشوازی میوان ئەکات و، میواندارییان ئەکات و، بەتەواوی سەربەستیەوە لەگەڵیاندا ئەدوێ و،وەک ـ ئافرەتی

موسولمانی تریش رووپۆش ناکات ، ژن هێنانیش لەئەنجامی یەکتر خۆشویستنەوە ئەبێ و ، پێش گواستنەوەیشی یەکتر ئەناسن ،بەپێچەوانەی تێکرای موسلمانانی ترەوە ، کە خواستنی کوڕ وکچی تیانیەو ،بەگوێرەی خواستنی خەڵکی تر ، سەرئەگرێ .
کورد ، لەژیانی رۆژانەیدا جووتیارێکی گورج وگۆڵە و، مرۆ کاتێ شوێنە دوورەکانی کوردستان ئەبینێ ، سەری لەوە سوڕئەمێنێ ، کە چ هیمەت وپشوویەکی درێژخراوەتەکار ، تا بەروبووم ، لەوکێڵگە سەختەو ، رووتانە بێتەبەرهەم " .
لەبەرگی - ٢١ - ی ئنسکلوپیدیا - ی گەورەشدا ، ئاواهاتووە :
" لەناوکورددا سۆزوخۆشەویستی خێزان زۆر پتەوە ، دڵسۆزن بۆیەکتر دڵپاکن ، میوان راگرن ، ئافرەتیشیان لەئافرەتی تورک سەربەستترە ، بەسەری رووتی هاتۆچوی دەرەوە ئەکەن ، هەریەک ژنیش ئەهێنن ، دەوڵەمەندەکانیان نەبێ ، رقیشیان لەتورکە ، کورد زۆرحەز لەمۆسیقاو هەڵپەرکێ ئەکەن " .
مسیۆ - هانری بندەر - یش لەکتێبەکەیدا " گەشتێ بەولاتی کوردان " دا ، ئەڵێ :
" پوختەی قسە ، پیاوگەلی کورد ، قۆزوجوانن ، زیرەکن ، دوای ئەوەش کەشارستانێتی پێشیان ئەخات ، لە دراوسێ تورکەکانیان پێشکەوتووتر ئەبن " .
مسیۆ - ا . ب . سۆن - یش لەکتێبەکەیدا " دووساڵ لەکوردستان"دا ئەڵێ :
" ئەورۆژەی هەستی کوردایەتی رائەپەڕێ ، ئەورۆژە ، دەوڵەتی تورک لەبەرنەمیا لەت وپەت ئەبێ " .
- پۆل بەندەر - یش لەوکتێبەکەیدا کەساڵی - 1926 - ز ،لەپاریس چاپی کردووە ، ئەڵێ :
" زمانی کوردی ، زمانێکی پاراوە ، دەنگەکانی سازە ،ئاسان وئاشکراو دەوڵەمەندو هەمەچەشنەیە ، لەبەرپاراوی ،بولای خۆیت رائەکێشێ ، ئەو پەندانەی تیایەتی ، شیرین و زۆر لەسەرزارن و، هەوێنی هەموو

ئاخاوتنێکن ، هەربەراستیش نیشانەوسیمای ژیانن و سروشتیان بەتەواوی بەسەرکردۆتەوە ، ئەم پەندانە هی کۆنترین سەدەکانی پێشوون زمانی کوردیش لە رووی رەوانبێژییەوە فەلسەفەی لەم کەمتر نییە و ، زمانێکی شیعریە ، شیعریش تیایدا هەموو لایەنێکی گرتۆتەوە وهەموویشی باسی سروشتە "

مسیۆ - مازیان هەرتمان - یش لەکتێبەکەیدا : ( Funf Vortrag Uber den ISLAM ) کەسالی - 1912 - ز لە - لایبزک - چاپی کردووە ، ئەڵێ :

" ئەورۆژەی ئەوسەرکردەیەی تیا دەرئەکەوێ ، کەکورد ئاتاجی پێیەتی ، ئیدارەو توانایەک بەهاوکاری لەگەڵ سنوور و کەلتوور و شارستانێتی گشتیدا ، ئەخرێنەگەڕ ، کەهەموو دنیا رێزی لێ بگرێ و گوێی پێ بدات " .

مسیۆ - ف - شارموی - ش کەکاتی خۆی مامۆستای پەیمانگەی ئاسیایی بووە ، لە - بترسبورگ - وئەندامی ئەکادیمیای زانستی ئیمپراتۆر بووە ، لەپێشەکی وەرگێرانی کتێبی - شەرەف نامە - داکە مێژووی کوردەو ، سالی - 1868ز - لە - پترسبۆرگ - چاپ کراوە ، ئەڵێ :

" لەنێوان ئەوگەلانەدا ، کەیەک بەدوای یەکدا لەسەرشانۆی دنیا دەرکەوتوون ، گەلی وایان تێدایە ، بەهۆی یادگارە بەنرخەکانیەوە ، بیرەوەری خۆی ، بۆنەوەکانی خۆی ، ئەگێرێتەوە ، کەپڕن لەمەزنایەتی دێرین ، وەک گەلی میسر ، کەهەرنیشتمانەکەی خۆی لانکەی فەلسەفەیە ، گەلانی تری وەک یۆنان و رۆمان - یش بەهۆی ئەو پێشکەوتنەوە کەلە هونەر و زانست وحیکمەتی یاسا و رژێمە سیاسیەکانیانەوە هەیان بووە ، شایستەی سەرنج راکێشانمان بوون ، بەجۆرێ کەناویان بۆتە هاوتای هەر دیاردەیەک کەلەمێژوودا بە بزورگی و نەبەزی ناوبەرێ ، گەلانی تریش هەن ، ناوبانگی خۆیان هەربەوە بیستووە کەتوانای تێکدان و وێرانکاریان لەهەموو ئەو ولاتانەدا هەیە ، کەخێڵە تینووەکانیان بۆ

وێرانکاری و ڕاووڕووت و تالآن بەسەریاندا ڕەت بوون ، وەک - هون - لەسەردەمی - ئاتێلا - و مەغۆل و ، تەتەر ، کە بەسەرکردایەتی - جەنگیز خان - ی بەناوبانگ ، بەلای هەر وڵاتێکدا ڕەت بوون و ، بەسەریاندا زاڵ بوون شوێنەوارو یادگاری بەخوێن سووربووی خۆیانیان تیا بەجێ هێشتووە .

گەلانی تریش هەن ، ئەم ناوبانگە دزێوەیان نیە ، ناوبانگی جوامێری پیاوگەلی گەورەو پێشەوایان ، لەجەنگ وئازایەتی و ، هەندێ سەرکردەیشیان ، کەپاشایەتیان لەئاسیاو ئەفریقیادا کردووە و ، بوونەتە مایەی شەرەف مەندی و شانازی بۆی ، وەک کورد ، کە لە سەردەمە کۆنینەکانی مێژووەوە - ڕۆستەم - یان کەبەڕاستی بە - هەرقل - ی ئێران ئەژمێردرێ و ، ئەوکارە مەزنانەش کە - سەلاحەدین - و - شاعادل - ی برای ، کردوویانە ، هاوشانی ئەوکارانەیە کەقارەمانانی ئەورووپایی وەک - فیلیپ ئۆگوست - و - ریشاردی شێردڵ - و - لۆزینیان - و ، گەورە پیاوانی تری جەنگیی ، لەشەڕی دووەمی خاچ پەرستەکاندا کردوویانە و ، مایەی سەربلندی دیانەکانن " .

هەرئەم گەلی کوردە ، ڕۆڵەی تری وەک - کەریم خان - ی خستۆتەوە کەلەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمدا - تیتۆس - ی ئێران بووە ، جگەلەمانەش ، کەلە مێژوونووس و ئەدیبانی زۆری وەک - ئیبن ئەثیر - ی جزیرەو - ئەبی فیداء - ی - ملک حماە - ی ئەیوبی ، کە وەک مێژوونووس و ، جوگرافی زان ، ناسراوە ، مێژوونووسی هەڵکەوتووی وەک - ئەدریس بەدلیسی - یش .

— — — — — —

# سەرەتای ناکۆکی کورد و تورک

پێشتر ئاماژەمان بۆئەوەکرد، کەکورد هۆی سەرەکی بوون بۆ سەرخستنی ـ سوڵتان سەلیم ـ ی[1] یەکەم، بەسەر ـ شائیسماعیلی سەفەوی ـ دا[2]، لەجەنگی ـ چاڵدێران ـ ی بەناوبانگدا وچۆن بەفتوا و پڕۆپاگەندەی ـ ئەدریس بەدلیس ـ ی حەکیم هاتنەژێر ڕکێفی سوڵتان سەلیمی یەکەمەوە، وپەیمانێکیان لەگەڵدا بەست، کە بەپێی ئەو ئەوپەیمانە سەربەخۆیی ناوخۆییان هەبێ و، لەکاروباری دەرەوەشیاندا سەربە خەلافەتی ئیسلامی بن.

ئەڵێین ئائەو کوردانەی کەلە هەزاران ساڵەوە، زەمانە ئەیانهاڕێ و، رووداوی زۆر گرنگی مێژووییان بەسەردا تێپەڕیوەوکارەساتی زەمانی زۆر ترسناکیان بەسەرهاتووەو، زۆرجار لەزۆرشەڕی گەورەو خوێناویدا، کەلەنێوان ئیمپراتۆریەتەکاندا رووی ئەدا، بوونەتە قۆچی قوربانی، ئائەو کوردانە لەبەرەبەیانی مێژووەوە، بەڕەوشتی خباوێنانەوە، جوانترین رەفتاریان لەگەڵ تورکدا نواندووەو؛ لەهەموو جەنگەکانی تورکیاو، لەخۆرهەڵات و، خۆرئاوایدا، بەخوێن وسامان وچەکی خۆیان بەشداریان کردووەو، بێ هیچ گومانێکیش گۆڕە بەرش و بڵاوەکانی عوسمانییەکان، لەئەفریقیاو، وڵاتانی عەرەبی و، ئەوروپا و، لەبەر شوورەی ـ ڤیەنا ـ دا لە ـ نەمسا ـ گۆڕێکی زۆری ئەوگەورە پیاوە کوردانەشی تیایە، کەلەپێناوی ناوبانگی سوپای تورکیادا، خۆیان کردووە بەقوربانی.

---

1- سوڵتان سەلیم: نۆیەمین سوڵتانی عوسمانی یە (1512 - 1520ز) - (م)

2- شائیسماعیلی سەفەوی: دامەزرێنەری بنەماڵەی سەفەوییەکانە لەئێراندا، وەک ئەڵێن بنەچە ئەچێتەوەسەر ئیمام موسای کاظم. لەکاتێکدا ئێران لەئاڵۆزی وپشێویدا ئەژیا، بەپشتیوانی خێڵە تورکەکان ئیش وکاری دەوڵەتی خستە ژێردەستی خۆی، شیروان وئازربایجان و کوردستانی عێراقی ـ کوردستانی باشووری ـ داگیرکرد، لەساڵی (1502ز) دا بانگی پادشایی بۆکرا، بەڵام لەجەنگی ـ چاڵدێران ـ دا عوسمانییەکان بەزاندیان و شەرەکەی دۆڕاند. (م)

لێکۆلینەوە مێژوویییەکان ئەوەیان سەلماندووە ،کەکوردستان پێشتر ئەوەی پەیوەندی بەتورکە موسمانییەکانەوە هەبێ ، باری لە ئێستای زۆر چاکتر و ، زۆر پێشکەوتووتریش بووە ، لەو کوردستانەی کە ئەمڕۆی ژێردەستەی ئەو تورکانەی ، کەوەک تێکڕای ئەو گەلانەی لەژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریەتی موسمانیدان ، دان بەهیچ شتێ لەمافی سروشتی ی کورد وکوردستانیشدا نانێن .

کوردستان،چوارسەدە لەمەوبەر ، لەهەموو ڕوویەکەوە لە ئێستای پێشکەوتوتر بووە ، چونکە لەرووی بەڕێوەبردنەوە زۆر گەشەکردووتر بووەو ، لەرووی زانستی و رەوشتیشەوە بالاتر بووە ،لەرووی کۆمەلایەتی و ئابوریشەوە ، لەئێستای چاکتربووە . بەلام ئەو تورکانەی هەر بە زۆرداری و تەزن و ، گیانی تێکدان و کاول کردن ، گۆش کراون ، کاتێ سەیریان کرد نیشتمانی کورد ، ئاسوودەیی و بەختیاری بالی بەسەردا کێشاوە ، سەرکردەکانیشی ئازاو ، بەهێزن ، بیریان لەوە کردەوە بەهەر ڕێگایەک بێ ، ئەم نیشتمانە بەهەشتە لەناوبەن ،چونکە ئەم تورکانە هەرئەوەندە بینیان لەولاتێک گیربێت ، ئیتر هەموودیارنەیەکی گەشە کردنی و بەختیاری لەناو ئەبەن و ، کاریان ئەوەیە خەلکی هێمن و بێ وەی ، پەرش وبلاو بکەنەوە .

بۆئەنجامدانی ئەم بەرنامە تەڕنکارانەیەی تورکەکەکان ئەوڕێکەوتن وبەلێنانەی پێشتر لەنێوان تورک و کورددا هەبوون و باسمان کردن ، نەبوونە ڕێگر ، ئەوەشیان لەیادکرد ، کەکورد بەویست وئارەزووی خۆی چۆتەپال تورک و، لەجەنگەکانی تورکدا ، گیان ومالیان بەخشیوە هاتن کەوتنە هونەری تازەترین ڕێگا بۆ دەست وەردانە کاروباری ناوخۆی میرنشینە کوردەکان و تێکدانیان و، لەناوبردنی ئەرکە پیرۆزە نیشتمانیەکانیان و ، شێواندنی رەوشت وخوی ڕێزلێگیراوی میللیان و لەم هونەرەدا بەجۆریک بوون ،ئەگەر پێوانەیەکی سیاسی ، لەگەل ـ میکافیل ـ ی بەناوبانگ و ، داهێنەری بنچینەی : جیابکەرەوە ، فازانج ئەکەیت ـ دا بەراورد پێ بکرێن لەگەل ئەم تورکانەدا ، ئەوا

ئەویان لەچاو ئەماندا ، پاشایەکی پاک و پیاوچاکێکی بەسزمان دەرئەچوو !

بۆجێ بەجێ کردنی ئەم سیاسەتە فێڵاویەش ، کەلەسوڵتان ـ سلێمانی قانوونی ـ[3] یەوە داکەوت ، کەدوای سوڵتان ـ سەلیمی یەکەم ـ هات بەوەی ناکۆکی و ، ناتەبایی و تۆوی کینەو ئیرەیی لەنێوان دوو ـ میرەی ئەومیرانەدا ئەچاند ، بۆ بەرپاکردنی ئاژاوەنانەوە . ئیتر خۆی ئەچوو بەهانای لاوازەکەیانەوەو ، بەهێزەکەیانی لەناو ئەبرد . پاشان لاوازەکەیشی والیێ ئەکرد چۆکی بۆ دابداو ، بیخاتەژێر رکێفی خۆیەوە ، بەم جۆرە لەیەک کاتدا دوو میرنشینی نیشتمان پەروەر وبەهێزناویان لەناو ناواندا نەئەما .

کتێبی ـ منشآت فریدوون ـ کە بە نموونەیەکی ئەدەبیاتی تورکی ئەژمێردرێ ، فرمانێکی تیایە ، لەلایەن سوڵتان ـ سلێمانی قانوونی ـ یەوە بۆ یەکەمین ـ والی ـ دەرچووە کەلەسەردەمی ئەودا لە ـ دیاربەکر ـ دامەزرێنراوە ، لەم فرمانەدا دەرئەکەوێ کەسوڵتانی موسڵمانان و ، خەلیفەی خوای هەردوو دنیا ، چۆن وەسفی ئەو کوردانە ئەکات ، کە بەخواستی خۆیان چوونەتە پاڵ و ژێرسایەی خەلیفەی ئیسلامی و ، دەسەڵاتداریتی تورکەوە . ئابەم رستە فارسیە وەسفیان ئەکات : " کوردهای بدنهاد " واتە : " کوردی ناپەسەن " !

پێمان وایە ئەم سۆزەی سوڵتان بەرانبەر نەتەوەیەک دەری ئەبڕێ کەتاوانی هەرئەوەیە دۆستایەتی و خۆشەویستی خۆی نیشان داوە ، نیشانەیەکی ئاشکرای ئاستی ئەو زوڵمەیە ، کەرۆژگار ئەمگەلە کڵۆڵەی خستۆتە ژێر چنگیان .

ئیتر سوڵتان ئەمەی کرد بەپەیرەو بۆهەموو ئەوسوڵتانانەی کە دوای خۆیشی هاتن ، بۆئەوەی ئەم سیاسەتە تەڕن کارە بەرانبەر بەو کوردە تەڕ ، سواردووانە بگرنەبەر ، تا هەموو میرنشینە کوردەکانی کوردستان

---

3- سوڵتان سلێمانی قانوونی : سوڵتانی دەهەمی عوسمانییەکانە و ، ناوبانگیشی لەهەموویان زۆرترە خۆی سەرکردەی ( 13 ) هێرشی کردووە ، ( 10 ) یان لەئەوروپادا و ( 3 ) یانیش لەئاسیا ، سنووری ئیمپراتۆرەکەی گەورەتر کردووە ، یاساو شەریعەتەکانی تۆمار کردووە ، ( م )

لە ساڵی - ١٨٤٧ ز - دا بە ئیجگاری کەوتنە ژێر حوکمی تورکەوە .

بەم جۆرە ئەو شوێنەواری ئاوەدانی و روخساری پێشکەوتن و شارستانیەتەی کە ئەوکاتە لەکوردستاندا هەبوون ، هەمووی بەهۆی بەرێوە بردنی تورکەوە لەناوچوون ، کەولاتی ئاوەدان و، پڕ لە قەلاو ، شار و ، گەشەکردوو ، لەزانست و هونەردا ، گیرۆدەی بوون ..... ئەو ولاتەی رۆلەی زانای خستۆتەوە ، وەک ئامەدی وحەصکەفی و گۆرانی و ئەبی سعودی ئامێدی و ئیبن ئەثیری جەزیری مێژوونوس و دینەوەری و، عەلی حەریری و ئەدریس بەدلیسی حەکیم و ، ئەبی فەزلی کوڕی و، ئیبن الصلاحی شارەزووری و، زانایانی بەناوبانگ وپێشکەوتوو لە جیهانی، ئیسلامیدا .

لەورۆژەوەی تورک پێیان ناوەتە خاکی پاکی کوردستانەوە ، ئارام و پشوویان نەبووە بۆلەناوبردنی زمانی کورد و، نەتەوایەتییان و، گالتە کردن بەکەلتوور و ئایین و خووڕەوشتیان ، بۆئەمەش ئەم تورکانە تازیاتر کورد نزیکتر بخەنەوە لەهەڕەمەکیتی و نەزانین و ئەشارەزووی کوشتن و دلڕەقی ی و، کاری ناشیرین ، هەموو دەرگاکانی شارستانی و زانین و زانستیان لەڕووی کورددا پێوە داوە .

بەلێ ئەم کارەساتانە لەکوردستاندا رووی ئەداو، میرنشین دوای میرنشین ئەڕوخاو، وردە ، وردە ، ئەچوونە سەر ولاتی تورک ، ئەمانەش هەموویان جێ پەنجەی وایان لەدلی نەتەوەی کورددا جێ ئەهێشت کە نەئەسڕدرایەوەو ، زامی تێ ئەکرد ، کەساڕێژنەئەبوو ... شاعیرانی نەتەوەی کوردیش ، ئەوانەی تاهاتنی تورک بۆ ولاتەکەیان ، شیعریان بۆچیا سەوزەکانی کوردستان و دەشتی رەنگین و تافگەی زیوین و رووباری زۆر ئەوت ، شیعرەکانیان پڕبوون لەو زولم وکوشتن و بڕینەی کەتورک لەکوردستاندا ئەیکات و ئەوکوێرەوەری و دەردی سەری و تەڕنکاری و، پەیمان شکاندنەیان سەرژمێر ئەکرد، کەپەیڕەوی ئەکەن و، ئەوەی ئەیانەوێ قەوارەی نەتەوایەتی تێک بدەن و ، ... ەلتووری نیشتمانی و ئیسلامیانەی کوێر بکەنەوە .

لەجیاتی ئەوەش کەکوڕان و کچانی کوردستان ،ئاواتی بەختیاری

بخوازن ، منالانی کوردستان بەدەم گۆش کران و ، گەورەبوونەوە ، ئەو سرودانەیان ئەوتەوە کە هەر دێرێکیان داوای راپەڕین وتۆڵەو هوشیاری ئەکرد ، لەتورکی دوژمنی سەرسەختی کورد ، لەنیشتمانی خۆی و دەرپەڕاندنی لەمالی خۆی و پەرش وبلاو کردنەوەی بەولاتاندا ، تا برسیتی کەلبەی لیێ گیربکات و، سەرما ، هەلی لەرزێنێ .

تورکەکان هەمووتەقەللایان خستەکاربۆنا وزڕاندنی ئەو شۆڕشانەی کورد ، کەلەڕووی زولم وزۆرداری و زەبروزەنگدا بەرپابوون و،هەولیان داو ئێستاش هەر هەولێ ئەوەئەدەن کە بیلکێنن بەپیلان و دەستکردی بیانەوە ، ئەوەیشی ئەیەوێ بکاتە راستی ، با لەوبارە رۆحیە بکات ،کە توندو تیژی تورک ، لەدلی ئەندامانی گەلی کورددا دروستی کردووە،کە تانێت ئەوبیرە طۆرانیە جۆش وکلپەی پێ ئەسێنێ ، کە پیاوگەلی - تورکیای کچۆلە - لەژێر پەردەی - یەکێتی عوسمانیدا - دایان هێناو ، پێرەویان پێ کردو، زەبروزەنگ و دزێوی کۆماری تورکیا ، لە سەدەی بیستەمدا ، ئاشکرا کردو جێ بەجێ کرد .

بۆزیاتریش تێگەیشتن لەم گیانی خراپەیەی کەلەدلی تێکڕای کورددا دروستیان کردووە ، ئەیان بینیت هەمیشەو، لەهەموو جێیەک بۆ داپۆشینی راستی وکوژاندنەوەی رووناکی خوا ، ئەوەباس ئەکەن کەبیانە دەستی لەولاتدا هەیەو ، ئیدارەی تورکیا تاوانی نییەو ، سیاسەتی ناوخۆیان بێ گەردە .

بەم جۆرە ناکۆکی کوردو تورک ، لەم روژەشومەوە دەستی پێ کرد، کە کورد وەک سەرکەوتنێکی - سوننی - بەسەر - شیعە - دا ، لکێنرا بە سولتان سەلیمی یەکەمەوەو ، لەبەر ئەو تەڕن و پەیمان شکانەی تورک و ، زەبروزەنگەو ئیدارە بۆگەنەیانەوە ، ناکۆکی دروست بوو .

کەواتە تائەو هۆیانە بەردەوام بن بۆئەوەی هەرئەم ناکامەیان هەبێ و، تاتورک بەردەوام بن لەزۆرداری و تەڕنکاریدا و تاڕەفتاریان کوشتن وئاوارەکردن و، دەرکردن بێ و، حاشالەمافی ژیانی گەل ـێک بکەن ، کەزۆر لەوان کۆنترە ، دیارە رق وقینیش بەرانبەرئەوە ،هەرزیاد ئەکات و شۆڕشیش دوای شۆڕش هەر بەرپا ئەبێ .

# مێژووی
# شۆڕشەکانی کورد و گەشەکردنیان

مسیۆ ـ ب . نیکیتین ـ لە وتارێکدا ، کە لە ژمارە ـ ١٠ ـ ی کانونی دووەمی ساڵی ـ ١٩٢١ ز ـ ی گۆڤاری ـ Mercure de FRANCE لە ژێر سەردێڕی : هەندێ وردبونەوە و سەرنج لە کورد ـ دا ، ئەڵێ :

" بە سەرکردنەوەیەکی وردی ئەو شۆڕشانەی کە کورد لە دژی تورک بەرپای کردوون ، لە وڕۆژەوەی پێیان ناوەتە کوردستانەوە ، شتێکە لێدوانێکی درێژی ئەوێ و ، پێویستی بە کتێبێکی سەربەخۆ هەیە " .

لێرەدا مەبەستمان لە دانانی مێژوویەکی تێروتەسەل نییە ، لە سەر ئەو شۆڕشە نیشتمانیانەی کە کورد لە پێناوی بەرگری لە نەتەوەو قەوارەیان کردوویانە ، بەڵکو مەبەست لە دانانی بڵاوکراوەیەکە ، بۆ ئەو شۆڕشانە ،تانەتەوەی عەرەب ، بە کورد و کوردستان بناسێنین و ، زانیاریەکی گشتی لە سەر ناکۆکی نێوان کورد و تورک ئاشکرا بکەین و ،ئەو بوختانانە پوچەڵ بکەینەوە کە تورک ئەیلکێنن بە کوردەوە و ، ئەو پەردەی درۆ و دەلەسەو چاووڕاوە بدڕێنین کە ڕاستییان پێ داپۆشیوە ،تا ڕاستی بێگەرد ببریسکێتەوە .

لە بەرتەوە هەرتەنیا گرنگێتی ئەو شۆڕشە نیشتمانیانە باس ئەکەین ، کە لە ماوەی ئەم سەدسالەی دواییدا بەرپابوون و ، هەندێ هەواڵی تریشی لە مەڕ جەنگەکانی میرانی جزیرە و بۆتانی ئەخەینە تەک ، کە لە گەڵ تورکدا کردوویانە .

لە ساڵی ـ 1806 ز ـ دا ئەورەحمان پاشای بابان ، شۆڕشێکی گەورەی لە شاری ـ سلێمانی ـ دا بەرپاکردو ، دووساڵی خایاند ، کە لە زۆرنە بەردا سەرکەوت ، بەڵام لە شۆڕشەکەدا کوژراو ، شۆڕشەکەش کۆتایی هات ، چونکە سەرکردەیەک نەبوو کە جێگاکەی بگرێتەوە[1] .

---

١- لەوە ئەچێ ئەو سەرچاوانەی نووسەر بۆ مەبەست نیشان کردنی مێژووی رووداوەکان ، پشتی پێ

لەساڵی - ١٨١٢ ز - دا ئەحمەد پاشای بابانی کە هەرلە وبنە ماڵە یە،
شۆڕشێکی تری دژی تورک کردو، لە زۆر نەبەردا بەسەریاندا سەرکەوت و،
تا نزیک - بەغدا - راوی نان و، ئەوەندەی نەما بوو بەغدا داگیربکات و،
بەتەواوی و بۆ ئێجگاری هێزەکانی تورک لەناوبەرێ، بەڵام چەرخی
چەپگەرد ئەم سەرکردە یەشی بەدەردی - ئەورەحمان پاشای بابانی،
مامی - برد، کە پێشتر باسمان کرد[2].

لە سالی - ١٨٢٠ ز - دا، کوردانی زازا، شورشێکیان بەرپا کرد،
کلپەی تا - سیواس - ی گرتەوەو، چەندمانگی دەوامی کرد، بەلام بەهوی
لی برانی تفاق و تەقەمەنیەوە، سەرنەکەوت و، بووە هوی ئەوەی هەر بە
چیاوە بمیننەوە، تا دواکەسیان لەناوچوون.

لە ساڵی - ١٨٢٩ ز - یشەوە، تا ساڵی - ١٨٣٩ ز - شۆڕش لە چەند
جێگایەکی - هەکاری و، رەواندز و طورعابدین - بەرپا بوون، هەموویان
ژێرکەوتن، محمدپاشا کۆریش هەرلەم مێژووەدا بوو.

---

بەستووە، راست نەبووبن، چونکە ئەورەحمان پاشای بابان - لە ساڵی (1805 ز - بەرانبەر بە 1220 کۆچی) یەکەمین شەڕی دژی والی عوسمانی لە - دەربەندی بازیان - کردووەو، ساڵی (1806 ز - بەرانبەر بە 1221 کوچی) شەڕی دژی ئێران کردووە، دووبارە لە ساڵی (1808 ز - بەرانبەر بە 1223 کوچی) دووەمین شەڕی لە - دەربەندی بازیان - دژی عوسمانییەکان کردووەو، لە ساڵی (1812 ز - بەرانبەر بە 1228 کۆچی) دا چوارەمین جار لە - کفری - لەگەڵ عوسمانییەکاندا شەڕی کردووەو، لە ساڵی (1813 ز - بەرانبەر بە 1228 ی کۆچی - شەوی یەک شەممە ڕێکەوتی 17 ی مانگی ربیع الاخیر، سەعات -5- ) کۆچی دوایی کردووە. کەواتە ئەورەحمان پاشا لە ساڵی - 1813 ز - دا کۆچی دوایی کردووە، نەک ساڵی - 1813 ز - کوژرابێ و هیچ شەڕێکیشی لە - سلێمانی - دا نەکردووە. (م)

2- ئەم مێژووەش هەڵەیە، چونکە وەک لە سەرەوە وتمان ئەورەحمان پاشا لە ساڵی 1813 ز - دا کۆچی دوایی کردووەو، دوای خۆیشی، کوڕەکانی و، بەتایبەتیش - محمود پاشا و سلێمان پاشا - ی کوڕی، کە لە کوڕەکانی تری گەورەتربوون، بەر لە دوا حوکمیان گرتۆتە دەست و، بەرنەوامیش لە سەر مەسەلەی حوکم گرتنە دەست، شەڕیان ژاوەیان بووە. ئەو - ئەحمەد پاشا - یەش کە لێرە باس کراوە، برازای ئەورەحمان پاشا - نییە، بەڵکو کوڕی - سلێمان پاشا - یە. واتە کوڕەزای ئەورەحمان پاشایەو، دوای مردنی سلێمان پاشا - ی باوکی، کە لە ساڵی 1836 ز - دا کۆچی دوایی کردووە، حوکمی گرتۆتە دەست. شاعیری گەورە - نالی - کە هاوچەرخی ئەو رووداوانەیە، قەسیدەیەکی جوانی سەبارەت بە کۆچی - سلێمان پاشا - و، دانانی - ئەحمەد پاشا - ی کوڕی، لە جێگاکەی وتووە، کە بەم تاکە بەیتە دەست پێ دەکات:

تاقە لەک دەورەی دەدا، سەد کەوکەبی فاوانە بوو
کەوکەبی ماهی موبارەک تالعی پەیدا نەبوو

(م)

له سالّی ـ ١٨٣٠ ز ـ یشدا شۆڕشه فراوانه‌که‌ی چیای ـ شه‌نگار ـ به‌رپا بوو ، که (٣) سێ سالّی خایاندو ، سه‌روماڵێکی زۆری تیا به‌قوربانی درا ، و ، پاشان تێشکا .

له سالّی ـ ١٨٣٤ ز ـ یشدا ، شه‌ریف خان ـ ی میری به‌ناوبانگی به‌دلیس ، شۆڕشێکی گه‌وره‌ی دژی زوڵم و پیلانگێڕی تورک به‌رپاکرد ، که ئه‌یانویست ده‌سه‌لاّت وشکۆی میرنشینه‌که‌ی لێ زه‌وت بکه‌نه‌وه ، به‌لاّم ئه‌میش سه‌رنه‌که‌وت .

له سالّی ـ ١٨٢١ ز ـ یشدا ، میربه‌درخان ، کاتێ ته‌مه‌نی هه‌ژده سالّ ئه‌بوو ، ده‌سه‌لاّتدارێتی میرنشینی جزیره و هه‌رێمی بوتان ـ ی گرته‌ده‌ست هه‌رکه جلّه‌وی فه‌رمانداریّتی گرته‌ده‌ست ، به‌وه‌وه‌نه‌وه‌ستا هه‌رته‌نیا میرنشینه‌که‌ی له پیلان وته‌ماعی نهێنی وئاشکرای ـ بابی عالی ـ بپارێزێ، به‌ڵکو بیری له‌رزگاری سه‌رتاسه‌ری کوردستان کرده‌وه ، له‌ده‌ست ئیداره‌ی سته‌م به‌خشی تورک و، دامه‌زراندنی یه‌کێتیه‌کی گشتی ، لـه نێـوان میرنشینه جیاجیاکانی کوردستان دا . ئه‌م میره هوشیاره ، هۆی سه‌ره‌کی سه‌رنه‌که‌وتنی ته‌واوی شۆڕشه‌کانی کوردو تێشکانه یه‌ک له‌دوای یه‌که‌کانی کوردی به‌وه‌نه‌ئه‌دی ، که‌کورد، له‌توانا و کۆششـدا له‌تورک که‌مـتربێ، یان تورک له‌کورد ، به‌هێزتربێ ، نه‌خێر ، به‌ڵکو لای ئه‌و له‌دوو هۆبه‌ده‌ر نه‌بوو :

١ـ یه‌کێ نه‌گرتنی هێزه‌کانی کورد ، له‌سه‌ربه‌رنامه‌یه‌کی یه‌کگرتـووی نیشتمانی .

٢ـ نه‌بوونی کارگه‌ی چه‌ک وته‌قه‌مه‌نی له‌کوردستان‌دا .

له‌به‌رئه‌مه میر ، پێش هه‌مووشتێ ده‌ستی کرد به‌کۆکـردنـه‌وه‌ی ریـزه جیاجیاکانی و، یه‌کخستنیان و ، ناردی به‌شوێن سه‌رکرده کـوردـه‌کانی دراوسێدا و ، داوای یه‌کگرتنی گشتی و ، کارکردنی لێکردن بۆ رزگـاری سه‌رتاسه‌ری کوردستان ، چونکه له‌ورۆژه‌دا ، جگه‌له‌میرنشینی بـۆتـان ، میرنشتینێکی تر نه‌بوو ، که‌ئازادی خۆی هه‌بێ .

بۆئه‌م بانگ هێشتنه‌ی میر ، هه‌مووئه‌م سه‌رکردانه‌ی لـه‌خـوارەوه ناویان ده‌ێنین ، به‌ده‌نگیه‌وه هاتن وبه‌په‌رۆش و شادیه‌وه ، چوونه نـاو

په یمانه که وه :
مسته فا به گ ، ئه رویش به گ ، محمودبه گ ، خان مه حمودی سه رکرده وسه روکی نا وچه ی ـ وان ـ نورئه لّلا به گ ـ ی سه رۆکی هه کاری ، فه تاح به گ ـی سه رۆکی هه کاری ، فه تاح به گ یه کێک بوو له سه رکرده کانی هه کاری ، خالدبه گ سه رۆکی خێرزان ، شه ریف به گ که یه کێک بوو له سه رکرده کانی نا وچه ی ـ موش ـ ، حسین به گی کور ، سه رۆکی خێلّه کانی هه ریمی فارس و قاجار ، شێخ محه مه د ـ که خه لّکی موسل بوو ـ ، له گه لّ شێخ یوسف که خه لّکی زاخۆ بوون و ، ئه وکاته له زانا به ناوبانگه کانی کوردستان بوون ، بانگ هێشتنی هه موو خێلّه کانی سه رتاسه ری کوردستانیان ئه کرد بۆیه کگرتنی پیرۆز و ، وتاریان بۆخه لّکی ئه خوێنده وه و ، ئه ومه به سته یان بۆخه لّکی روون ئه کرده وه که میر ـ هه ولّی بۆئه دات .
بانگ هێشتنه که ی ـ میربه درخان ـ یش ته نیا بۆکوردستانی تورکیا نه بوو ، به لکو گه یشته کورده کانی ئێران یش ،بۆیه میر ـ ی ئه رده لآن ـ نا وچه ی کوردستانی لای فارس ـ به ده نگ بانگ هێشتنه که وه هات و ، چووه په یمانه پیرۆزه که وه .
ته قه للای میر ، هه رله م بواری کاره سیا سیانه دا نه بوو ، چونکه له هه مان کا تیشدا له رووی سه ربازی وجه نگیشه وه ، خۆی سازو ته یارکرد ، ئه وه بوو له شاری جه زیره ، دوو کارگه ی بۆچه ک وبارووت دروست کردن دا مه زراند و ، پۆلێ قوتابیشی نارده ـ ئه وروپا ـ بۆ شاره زابوون له چه ک و ته قه مه نی و پێویستیه کانی جه نگ و کارتیاکردنی و ،ده ستیشی کرد به دروست کردنی پاپۆڕ ، بۆ پاپۆره وانی له زه ریاچه ی ـ وان ـ دا .
جارناجارێکیش هێزێکی سه ربازی ئه نارده سه ر ئه ومیر و سه رۆکه کوردانه ی دوودلّێ له هاتنه ناو په یمانی پیرۆزه وه ، هاوکات له گه لّ ئه مانه شدا و ، رێکه وت دیانه کانی میرنشینی بۆتان ، وه ک پێویست باجیان نه دا به میر ، بۆیه میریش هێزێکی سه ربازی ده هه زار که سی نارده سه ریان و زۆرباش ته مێی کردن .
ئه م شتانه گه یشتنه ـباب عالی ـ و ، سلّ وپه ژاره ی له هێزی میر به درخان په یدا کرد و ، بیری له وه کرده وه هێزێکی سوپایی بنێرێته سه ری

و ، شه‌ڕی بکات . به‌ڵام سه‌ره‌تا وای به‌چاک زانی پێشه‌کی به‌سیاسه‌ت
له‌گه‌ڵیا بجووڵێته‌وه ، بۆیه دوو نوێنه‌ری پارێزگاکانی - ئه‌سه‌ستانه - و
- دیاربه‌کر - ی ناردنه‌لای ، تاڕای وه‌ربگرن و، سوێندو په‌یمانیان پێدا
ناردبوون که‌ئه‌گه‌ر میر ده‌سته‌به‌رداری بیری یه‌کێتی‌ی کوردو یه‌کگرتنی
کوردستانی گه‌وره ببێ ، ئه‌وا سنووری میرنشینه‌که‌یشی فراوانتر ئه‌کات ...
ئه‌وروپاش که‌هه‌رگیز سێ و دووی له‌سوپاکردنه‌سه‌ر ئه‌وگه‌لانه نه‌کردووه ،
که‌له‌ژێر رکێفی ده‌رئه‌چن و، به‌هه‌رچی ئامێرو چه‌کی تازه‌ی کاولکاری و،
هه‌موو هێزو توندوتیژییه‌وه ، شۆڕشه‌کانیان دائه‌مرکێنێته‌وه ... بۆیه
ئه‌میش به‌ناوی به‌رگری له‌حه‌زره‌تی مه‌سیح ، خرۆشاو ، له‌و رۆژانه‌دا
ناڕه‌زایی له‌میربه‌درخان ده‌ربڕی ، که‌به‌بیانووی ته‌مێ کردنه‌وه ئازاری
دیانه‌کانی داوه ، میربه‌درخان - یش که‌به‌وه‌ناسرابوو داپه‌روه‌ربێ و،
هه‌وڵ بدات یه‌کسانی له‌نێوان دانیشتوانی میرنشینه‌که‌یدا ، به‌بێ
جیاوازی له‌ره‌گه‌زو، ئایین‌دا بپارێزێ و ، هه‌رله‌یه‌که‌مین رۆژی جڵه‌و
گرتنه‌ده‌ستی میرایه‌تیه‌وه ، فرمانی ده‌رکردبوو ، که‌ڕێگانه‌درێ که‌س به‌
زۆر جل وبه‌رگێکی تایبه‌تی پێ له‌به‌ربکرێ و، ئه‌وه‌ش قه‌ده‌غه‌بکرێ ،که‌
ئه‌گه‌ر سواره‌یه‌کی دیان ، سه‌رکرده‌یه‌کی پیاده‌ی کورد ببینێ ، ئه‌بێ ئه‌و
دابه‌زێ و کورده‌سه‌رکرده‌که سواربێ و .. گه‌لێ ره‌وشت وخووی تری
کۆن و ، هانی ژن وژن خوازیشی ئه‌دا له‌ئافره‌تی ئه‌رمه‌نی و دیان ...
میرێکی ئه‌ئاواهانی ئه‌م هه‌مووکاره دیموکراتیانه‌بدات ، که هه‌موو
گه‌لێک ئاواتی بۆبخوازێ ، رێی تێ‌ناچێ ته‌مێ کردنی دیانه‌کانی‌بۆته‌وه
بووبێ بیانووی ئایینیان پێ بگرێ ، چونکه میر ، به‌هه‌مان توند و
تیژییه‌وه که‌له‌گه‌ڵ دیانه‌کاندا جووڵاوه ، له‌گه‌ڵ ئه‌و کوردانه‌شدا هه‌ر
به‌وجۆره جووڵاوه که‌به‌ده‌نگ بانگ هێشتنی یه‌کێتی‌ی پیرۆزی
کوردانه‌وه نه‌هاتن ، له‌به‌رئه‌وه‌ی میر ، پێش ئه‌وه‌ی بیێته سه‌ر
ئه‌نجامدانی سیاسه‌تی یه‌کێتی‌ی پیرۆز و رزگاری کوردانه‌وه پێویستی
ترین ئه‌رکێک ، که‌ئه‌بوایه‌به‌ئه‌نجامی بگه‌یه‌نێ ، له‌ناوبردنی ئه‌و
جیاوازیانه‌بوو، که‌له‌ناوخۆی سنووری میرنشینه‌که‌یدا هه‌بوون .

به‌ڵێ ، له‌پێشدا ئینگلته‌ره‌و، دواییش فه‌ره‌نسا، ناڕه‌زاییان به‌رانبه‌ر

میربەدرخان ، لای - بابی عالی - دەربڕی ، کە تەمێی بکات بۆ دیانەکان و ، نارەزاییەکەیان بەوە چووواندبوو ، کە گوایە کوشتاری گشتی هەموو دیانەکانی کردووەو ، داوا ئەکەن میر ، لە میرنشینەکەی بێ دووربخرێتەوە ماوەی ساڵێکیش ئەبوو، نامەگۆڕینەوەی سیاسی وشیداری لە نێوان - بابی عالی - و دیاربەکرو ، موشیری ئەنادۆڵدا بەردەوام بوو ، دەربارەی ئاگاداربوونیان لە نیازی میر و ، چۆنیەتی لەناوبردنی بەرنامەکانی و، پوچەڵ کردنەوەی بزووتنەوەکەی . بۆیە ئەم خۆتێهەڵقورتانەی ئینگلتەرەو، فەرەنسا و نارەزایی دەربڕینیان ،هەلێکی لەبارتری بۆ - بابی عالی - رەخساند کە لەگەڵ میردا توندو تیژتر بجووڵێتەوە ، ئەوەش لە ولاوە بوەستێ ، کە ئەوهەردووە وڵاتە پەیمانیان دا بە حکومەتی تورک ، کە ئەگەر پێویستی کرد ، ئامادەن یارمەتیی بدەن . بۆیە - بابی عالی - زیاتر هاندراو - موشیر حافظ پاشا - راسپێردرا ، کە لای خۆیەوە نوێنەرێکی کوردیزان بنێرێ بۆلای میر ، تا هەڵوێستی خۆی بەرانبەر بە - خەلیفە - روون بکاتەوە - حافظ پاشاش - پیاوێکی ناردەلای ، ناوی - محمود ئەفەندی - بوو، بۆئەوەی قسە لەگەڵ میردا بکات و ، بە ناوی خەلیفەوە بانگ هێشتنی میر بکات بۆ - ئەستانە - .

دیارە میریش نەیئەتوانی بچێت بە دەنگ ئەم بانگ هێشتنەی - بابی عالی - یەوەو ، ئەو میرنشینەی کە لە باوک وباپیریەوە بە میراتی بۆی جێ مابوو ، هەروا بە ئاسانی بەجێی بهێڵێ و، بە دەستی خۆی چرای دوا میرنشینی نیشتمانی کوردی بکوژێنێتەوە ، کە چەندان میرنشینی تر بە پیلانی دەوڵەت و ناکۆکی ناوخۆی کوردستان لەناوچوون ، لەبەرئەوە بانگ هێشتنەکەی - بابی عالی - رەت کردەوەو ، ئەوەندەی تر گوڕی دایە بەرخۆی بۆ سازدانی لەشکرو ، تەیارکردنی پێویستیەکانی شەڕ.

بابی عالی ـش هێزێکی سەربازی گەورەی ناردە سەرمیرو،لە سەرەتادا میر زۆر بە ئاسانی توانی تێکی بشکێنێ و ، بەمە میر پەیوەندی خۆی لەگەڵ - بابی عالی - پچڕاندو بانگی سەربەخۆیی کوردستان و، جیابوونەوەی لە دەوڵەتی عوسمانی ئاشکرا کردو، پارەو دراوی بەناوی

خۆیه‌وه له‌ سالی (١٢٥٨) کۆچی دا لێدا ، که‌له‌ رووبه‌کیا ندا نووسرا بوو :
میری بۆتان ، به‌درخان و، رووه‌که‌ی تریشی سالّی ١٢٥٨ کۆچی و ،
ده‌ستی کرد به‌گه‌وره‌کردنی میرنشینه‌که‌ی له‌قوڵێکه‌وه تا - وان - و له‌
قوڵێکی تریشه‌وه تا - سابلاّخ - و - ره‌واندز - و - موسل - فراوان بوو ،
قه‌لاّی - شه‌نگار - و شاری - سه‌عرت - و - وێرانشه‌هر - و-سێوه‌رۆکی
گرت و ، گه‌یشته شووره سه‌خته‌که‌ی دیاربه‌کر .

له‌م کاته‌دا شۆڕشێک له‌موسلّ به‌رپا بوو، له‌به‌رئه‌وه له‌شکره‌که‌ی لێره
به‌جێ هێشت و، خۆی به‌هێزێکی ته‌واوه‌وه گه‌رایه‌وه بۆموسلّ ، تا
ئاسایش وهێمنی بگه‌ڕێنێته‌وه دۆخی جارانی .

له‌کاتی گه‌ڕانه‌وه‌یدا له‌موسلّه‌وه به‌ره‌وباره‌گای قه‌لّه‌مڕه‌وییه‌که‌ی خۆی
له‌جزیره ، رووی به‌لای خۆرئاوادا وه‌رگێڕا و ده‌ستی به‌سه‌ر سابلاّخ وسنه و
ورمێ - ی سه‌ربه ولاّتی فارس‌دا گرت .

به‌لاّم ئه‌مجاره‌یان - بابی عالی - زۆر گه‌وره‌و گرانتر خۆی بۆسازدا و،
هه‌رچی هێزی نیزامی و، غه‌یره‌نیزامی ئه‌وخه‌لّکه‌ی - ئه‌نادۆلّ - ه که
داوای چه‌ک هه‌لّگرتنی لێ کردبوون ، کۆی کردنه‌وه ، خستنیه ژێر
فه‌رمانده‌ی - عوسمان پاشا - وه‌و فرمانی پێ کردن بچنه‌سه‌ر میر
به‌درخان . سه‌رکرده‌ی قۆڵی لای ڕاستی ئه‌م له‌شکره‌گه‌وره‌یه‌ی تورک
- ژه‌نرال عومه‌رپاشا - و سه‌رکرده‌ی قۆڵی چه‌پیشیان میرلیوای جه‌نگ
- سه‌بری پاشا - بوو .

یه‌که‌مین پێکدادانی نێوان هێزی کوردو ، ئه‌م سوپایه له‌ نزیک
- ورمێ - بوو، که‌تیایدا میر سه‌رکه‌وت . هه‌والّی ئه‌وه‌ش گه‌یشت که
- عیزه‌دین شێر - ی سه‌رکرده‌ی قۆڵی لای چه‌پی له‌شکری کورد ، که‌خزمی
میر خۆی بوو، چۆته‌پالّ تورک و، به‌یارمه‌تی سوپای تورک ، باره‌گای
میرنشینه‌که‌ی له‌جزیره داگیر کردووه . میر - یش له‌به‌رئه‌م ئه‌م باره‌دا
ناچاربوو هێزێکی ته‌واو ، له‌به‌رانبه‌ر هێزی تورکدا ، له‌مه‌یدانی‌جه‌نگدا
به‌جێ بهێلّێ و، خۆی به‌هێزی تری گه‌وره‌وه بچێت بۆبه‌ڕه‌نگاری
- عیزه‌دین شێر - وئه‌وتورکانه‌ی له‌گه‌لّی بوون ، دوای چه‌ند شه‌ڕێکی
خوێناوی توانی تورکه‌کان وعیزه‌دین شێر-ی هاوپه‌یمانیان له جزیره

ئەرپەڕێنێ .

بەڵام ئەوخۆفرۆشییەی عیزەدین شێر ، هەرتەنیا میربەدرخان - ی نائومێد نەکرد لەبەروبومی سەرکەوتنە گەورەکەی بەسەر لەشکری تورکدا ، لەمەیدانی شەڕی نزیک ورمێ دا ، بەڵکو بووەسۆنگەی تێشکانی هەموو ئەو هێزە کوردیانەی رووبەرووی ئەوهۆردووەی تورک ببوونەوە ، کەلەنزیک ورمێ سەربازگەیان کردبوو، وەئەوەندەی تریش بەهێزببوو، کەهێزە بەزیوە تورکەکانی لای - جزیرە - یشی هاتبوونە پاڵ ، ئەمەمیر بەدرخانی ناچارکردلەجزیرە بکشێتەوە بۆقەڵای سەختی - ئاروخ - .ئیتر تورکەکان و عیزەدین شێر - یش لەگەڵیاندا گەماروی قەڵاکەیان دا ، کە ماوەی هەشت مانگی خایاندو ، شەڕیش هەربەرنەوام بوو.

حاڵ بەم جۆرە ئەڕۆیشت ، تا ئازوقەو تەقەمەنی لەناو قەڵاکەدا نەما، بۆیە میر ناچاربوولەناو قەڵاکەوە هێرشێکی لەپڕ بکاتەسەریان ، بەڵام ئەمجارەیان بەختی یارنەبوو، تووشی تێشکانێکی گەورەبوو. بەم جۆرە تاکەهیوای لەهەموو دنیادا کەرزگاری تەواوی کوردستان و، یەکگرتنی گشتی پیرۆز بوو ، نەهاتەدی[3].

بابی عالی و تورکەکانیش بەم ئەنجامەگەشەبوون ومەدالیایەکیان بۆ بیرەوەریەکەی دروست کرد، ناویان نا : مەدالیای جەنگی کوردستان ، کەرووبەکیان لێی نووسرابوو : " مەدالیای کوردستان " و رووەکەی تریشی وێنەی قەڵای سەختی " ئاروخ " ی لەسەرنەخشێنرابوو[4].

3- میربەدرخان کوڕی عەبدولخالق بەگەو ، سالی 1802 ز - لەدایک بووە ، ئەم بووە ،کە پەیوەندی بە ئیبراهیم پاشای کوڕی محمدعەلی پاشای گەورەی میسرەوەکردووە ، بوهاوکاری و جەنگان. دژی عوسمانی.لەدوای تێشکانی شۆڕشەکەی و، لەئەنجامی خیانەتی : یەزدان شێر و هەندێک سەرۆک عەشیرەتی تردا ، لەئابی 1847 ز - دا خۆی ئەدابەدەست هێزەکانی - حافظ پاشا - ی تورکەوە، دوای ئەمە ئاوارەی ئەکەن بۆ - قارنا - لەبولگاریاو دوورگەی - کریت - . لەدواییدا مۆڵەتیان دا بچێتە - دیمەشق - ولەسالی 1848ز - دا لەوێ لەناوچەی - رُکن الدین - کۆچی دوایی ئەکات ( رۆژنامەی گەل / الشعب - ژمارە 11 ل 11 ) - ( م )

4- بڕوانە بەرگی - 8 - ی مێژووی - لطفی - و مێژووی کوردونەرمەن کە - شاهباز - نووسیویەتی و سالی 1911 ز - لەئەستانە - چاپ کراوە ، کتێبی ئەبنەواوبابل کە (سێرهێنری لایارد) نووسیویەتی و سالی 1853 ز - لە - لەندەن - چاپکراوەو، فەرهەنگی ناوبارانی ئەڵمانیاو کتێبی -کۆمەڵیادداشت و سەرگوزشتەی کوردی - کە مسیۆ - بابا - ی شابەندەری رووسی لەئەرزەرووم سالی 1860 ز- چاپی کردووەو،مێژووی میرانی کورد کە - شێخ سولتان ممدوح - نووسیویتی .

لە ساڵی - ١٨٧٧ ز - یشدا جەنگی نێوان تورک ورووس روویدا ، بابی عالی خەڵکێکی زۆری - متطوع - ی کوردستانی کرد بە سەرباز و بەشێکی زۆری ئەم هێزانەی بە نەوەکانی میربەدرخان سپارد.

حسین کەنعان پاشاو ، عوسمان پاشا - ش ئەم هەلەیان لە وسەرکردانە قۆستەوەو ، لەگەڵ ئەوئەفسەرو سەرکردانەدا رێکەوتن ، کە لە ژێر فەرماندارێتیاندا بوون و لەناوخۆیاندا بریاریاندا بە مەبەستی هێنانەدی ئەوئاواتە پیرۆزەی کە باوکە مەزنەکەیان تیایدا ژێرکەوت[5]، رووبکەنە کوردستان بۆجێ بەجێ کردنی کە - یەکێتیی کوردستان و رزگارکردنی بوو - بوئەمە ، ئەم دوومیرە کوردە ساڵی - ١٨٧٩ ز - بە نهێنی چوونە کوردستان و، لەناکاوێکدا لە - جزیرە - سەریان هەڵداو، دەستیان بەسەر کاروباری ئەوێدا گرت و، دەست بەجێ بانگی سەربەخۆیی کوردستانیان ئاشکرا کرد ، چەندجارێکیش بەسەرئەو هێزە سەربازییە تورکیانەدا سەرکەوتن ، کە لە هەموو قوڵێکەوە هێرشیان ئەهێنایە سەریان ، تانزیک - جولەمێرگ ، لە مەڵبەندی هەکاری و ، زاخۆو ئامێدی وماردین و مدیات و نصیبین - یشیان گرت و ، میر عوسمان کە گەورەکەیان بوو - بانگی میرایەتی میرنشینی داو، لە جیاتی ناوی سوڵتان - یش ، لەوتاری - هەینی - دا ناوی ئەم هێنرا .

ئیتر بە زینی یەک لە دوای یەکی هێزەکانی تورک و بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی میر عوسمان ، لە سەرتاسەری وڵاتی کورددا ،سوڵتانی سەردەم - سوڵتان عبدالحمید -[6] ی ناچارکرد سیاسەتی خۆی بەرانبەر بە کوردو

---

5- سەبارەت بەم شۆرشەو ، خۆشەویستی وشەیدایی کورد، بۆئازادی وسەربەستی ، (باسیل نیکیتین) لەکتێبەکەیدا - کورد - کە رۆژهەڵاتناسی فەرەنسی بەناوبانگ - لویس ماسینۆن - پێشەکی بۆنووسیوە، ئەڵێ : " سەرۆکێکی کورد، لە هێرشێکی - حافظ پاشا - دا بەدیل گیرا ، ساڵی 1837ز- بەدیلی تورکەکان گفت وبەڵێنێکی مشەی بۆهەڵەڕێژن ، تا رێ وشوێنی سەنگەری پێشمەرگەکانی کوردیان پێ بڵێت ، بەڵام ئەمیش مەردانە ، وەڵامی ئەوبەرتیلانەی ئەدایەوە : سەرۆکی کورد،هەرگیزا وهەرگیز ناپێتە چاوساغ وتانجی بێگانان ، دوو رۆژیش ئەیخەنە ژێر ئازاروئەشکەنجەو هیچیان لێ نەبیست ، تامەنجەڵێک رۆنیان قرچاندو، خستیانە ناویەوە ، بەوشێوەیە دانی بەخۆیا گرت و، ئەو مردنە پڕ شکۆیەی هەڵبژارد. - الاکراد - ص 68- دارالروائع - ( م )

6- سوڵتان عەبدولحەمید ( 1842 - 1918 ز ) بەزۆرداری وخوێن ڕێژی ناوبانگی دەرکردووە ، لە سەردەمی ئەمیشدا بووە قەسابخانە بۆ - ئەرمەنەکان - دانرا ( م ) .

کوردستان بگۆڕێ ، بەتایبەتیش بەرانبەر بنەماڵەی-بەدرخانییەکان-
ئەوشتانەی کە بابی عالی ناچاربوو بیکات بەردانی هەموو ئەوانـــە
بوو کە لە بنەماڵەی بەدرخان گیرابوون ، راشپاردنەشی ناردنە لای هەردوو
میرە تێکۆشەرەکەی کوردستان ، تاپێیان بوترێ بــا ئـیتر خــوێنــی
موسلمانان نەڕژێ و ئامادەشە بەرێگای ئاشتی ،وەلامی داخوازیەکانیان
بداتەوە ، ئیتر هەردوو میر لەسەرقسەی براکانیان و خزمەکانیان ، کــە
ئەوکاتە لە - ئەستانە - بوون و، ئەوەیان سەلماند کەسیاسـەتی ئـەم
دواییەی سولتان ، سیاسەتێکی نەرمە ، هەردووکیان کەوتنە وتــو وێـــژ
لەگەڵ تورک دا ، لەسەر رێکەوتن و هێنانەدی داخوازیەکانی کـــورد ،
ئەوەیشی کە ئەوەندەی تر متمانەی هەردوو میر - ی بەتورک پەیدا کرد ،
ئەوپێشوازی و بەپیرەوەهاتنە گەرمە بوو، کەلە هەموو کۆبوونەوەکانـــدا
لەگەڵیان ئەکردن و قسەی گفتوگۆکەرانی تورک بوو، لـــەوەدا کـــــە
ئەیان وت داخوازیەکانی هەردوو میر ئەهێننەدی ، نەک هەرتـەنیـا
لەسنووری میرنشینی بۆتان دا ، بەڵکو لەسەرتاپای کوردستان دا چونکە
گفتیان ئەدا کەسەربەخۆیی ناوخۆی کوردستان ئەدەن ، بەرانبـەر بــە
هەندێ مەرجی شاراوە ، کە پێویستی بەزۆرتر وردبوونەوە و،بیرکردنـەوەی
تر هەیە .

ئەم هەموو دیاردانەی لای تورک ،کاریان لەهەردوو میری بەدرخان
کردو، وایان لێ هات ژمارەی ئەوپاسەوان ویاوەرانەیانکەم ئەکردەوە
کەلەگەڵیان ئەهاتن و ئەچوون بۆ کۆبوونەوەکان و، تا بارەگای کـۆڕ و
کۆبوونەوەکان لەگەڵیان ئەهاتن و ئەمانەوە ، تورکەکانیش هــەر بــە
ئارەزوو، جێگا گۆڕکێیان لەجێگای کۆبوونەوەکاندا ئەکرد ، رۆژێکیـــان
کۆبوونەوەکەیان لە جێگایەکدا گرت ، هێزی تورکی چەندان ئـەوەنـدەی
هێزەکەی کورد ئەبوو ، ئیتر تورکەکان بەهەلیان زانی و،پێشــتریش
پیلانەکەیان سازکردبوو ، بۆیە هێزی تورک ، دەوری هـەردوو مـیـر و ،
پاسەوانەکانیان دا و دەسگیریان کردن و، گرتنیان و ، بــەدەســـت
بەستراوی ناردیانن بۆ - ئەستانە - دیارە وابش چاوەروان ئـەکـرا ،
بەلای کەمەوە لەسێدارە بدرێ، ،بەلام سولتان لەرزی ئەوەی لێنیشت،

نەک ئاگری شۆرشێکی سەرتاسەری لە کوردستاندا کلّپە بسێنێ ،لە بەرئەوە بەوەندە وازی لێ هینان کە ماوەیەک لە قولاّیی زیندانەکانی ئەستانەدا توندیان بکات و، پاشان بەرەڵلای کردن و، لە ئەستانە دەست بەسەر هێشتنیەوە .

لە ساڵی ـ ۱۸۸۱ ز ـ یشدا شێخ عبیدالله ـ لە شاری ـ شەمدینان ـ شۆرشێکی گەورەی بەرپاکرد ، داوای سەربەخۆیی ناوخۆی سەرتاسەری کوردستانی ئەکرد ، لە ژێر سێبەری تورکدا . لە سەرەتادا بەختی هێزەکانی شێخ ، یاربوو ، تالەگەڵ هێزی سوپای ئێراندا پێکیان داو ، شەڕی توندو خوێناوی لە نێوانیاندا روویداو ، تیایدا شێخ شکاو ، نوشوستی هێناو ، گیراو ، ئاوارەی ـ مەدینە ـ یان کردو هەرلەوێش کوچی دوایی کرد(7).

لە ساڵی ـ ۱۸۸۹ ز ـ یشدا ـ ئەمین عالی بەگ ـ و ـ مەدحەت بەگ ـ ی نەوەی میربەدرخان ، بەنهێنی ـ ئەستانە ـ یان بەجێ هێشت و ، چوونە ـ تەرابزون ـ لەوێ بەهۆی ـ مستەفا نوری ئەفەندی شاملی ـ ناوێکەوە کەوتنە پەیوەندی کردن بە پیاوگەلی کوردستانەوە و،لەگەڵیان رێک کەوتن کە هێزێکی گەورەی چەکدار بەسەرکردایەتی هەندێ لە سەرانی کورد ، بێنە جێگایەک لە ناوەندی رێگای ئەرزەروم وتەرابزون کە ، پێیی ئەوترا ـ چویزلک ـ و ، لەوێ چاوەرێیی گەیشتنی هەردوومیرە کە بکەن . ئیتر ئەوهێزە کوردەی لەگەڵیا رێک کەوتبوون ، گەیشتە شوێنی دیاری کراو، هەردوو میر ـ یش بەنهێنی چوون بوئەوێ ، بەلاّم هەرئەوکەسەی کە بەهۆیەوە پەیوەندییەکان ئەکرا ، تەواوی کارەکانی بەرێگای تردا لە بابی عالی ئاگادار کرد ، تا فەرمان بدات زۆربەپەلە هێزێکی گەورەی سەربازی ، بەشێوەیەکی نهێنی ، لە ئەرزەروم و ئەرزنجان ـ ەوە بنێرێ بو ئەمبەرو ئەوبەری ئەورێگایەی هەردوومیر-ی بێ ئاگای لەم کارە پیایدا تێپەرئەبن .. هەردوو میرەکە هاتن و هێزە ناوبراوەکەشیان لەگەڵدا بوو ، لە ناکاوێکدا کاتێ بەخۆیان زانی لە نامێنی شاری ـ بایبورت ـ دا ، لە نێوان هەردوو هێزی گەورەی تورکدان

---

7- شێخ عوبیدوللای کوری شێخ طه ـ ی نەهریە و ، لە ساڵی 1883ز ـ دا کۆچی دوایی کردووە ( م )

و ، زانیان ئەمە بۆسەیەو، بۆیان نراوەتەوەو، لێیان بووە ئەرێکی سەخت و خوێناوی و، تیایدا هێزەکانی کورد تێشکان و ناچار بوون بدەنە کێوی ـ ئەرغەنی مەعدەن ـ و لەوێ بەرگری بکەن . بەم جۆرە ماوەیەکی زۆر ئەڕخایاندی تا هەردوو میر ناچاربوون لەبەرکز بوونەوەی وردە وردەی هێزەکانی کورد و گەیشتنی هێزی تری تورکی بەهانای تورکەوە لە هەموو لایەکەوە خۆیان بدەن بەدەستەوە.[8]

بەڵێ ئەم هەموو شۆڕشانە بەرپابوون و، تاقەیەکێکیشیان سەری نەگرت . بەڵام پڕبوون لەکەڵک ، چونکە ئاگری حەماسەتی نیشتمانییان لەسنگی تێکرای کوردی ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا خۆش ئەکرد و ئاواتی خاموش بوویان تیا زیندووئەکردنەوەو، نەیان ئەهێشت گیانی نیشتمانیی ، لەدڵی نەتەوەی کوردو نەرەوەی کوردستانیشدا بکوژێتەوە سەرباری ئەوترس ولەرزەی کەلای تورکیش دروستیان ئەکردو ، بواری نەئەدان پیلانە گڵاوەکانیان بەتەواوی دژی کوردوکوردستان جێ بەجێ بکەن .

لەساڵی ـ ۱۹۱۲ ز ـ یشدا شۆڕشێکی تری کورد لەویلایەتی ـ بەدلیس بەسەرۆکایەتی ـ مەلاسەلیم و شەهابەدین وعەلی ـ بەرپابوو کلێپەکەی تا شەقامەکانی شاری ـ بەدلیس ـ یشی گرتەوە . ئەمیش دیسان بەهۆی فرە هێزی تورکەوە ژێرکەوت و ـ مەلاسەلیم ـ ی سەرکردەی ناچاربوو پەنا بەرێتە بەرشابەندەری رووسی لەبەدلیس دا ، لەوێ مایەوە ، تا تورکیا بانگی جەنگی بەسەر رووسیادا ئاشکرا کردو پیاوەکانی تورکیاش ئەمەیان بەهەل زانی و، لەم کاتەدا هەڵیان کوتایە سەر بارەگای شابەندەری ناوبراو و سەلیم ـ یان گرت وهەرلەشەقامەکانی شاری بەدلیس دا هەڵیان واسی .

ئەمە پوختەی ئەوشۆڕشە نیشتمانیانەی کوردبوو، کەپیاوان و بنەماڵەی جیاجیای کوردستان ، دژی حکومەتی تورکیا ، لەم سەدەیەی

---

8- بڕوانە : دائرة المعارف الأسلامیة ـ ی مینۆرسکی ، بەزمانی فەرەنسایی و، کتێبی کوردەکـــە : A . Verlanov نووسیوێتی .

دوا یيدا له پێش جه نگی گشتیدا [9] به رپا یا ن کردبوو بۆ به رگـری لـــه قه وا ره ی نه ته وا یه تی و، یه کێتیی کوردستا نی پیرۆز .. ئێمـه ش زۆربـه کورتی باسما ن کردن .. وا پوخته یه کیش له مێژووی بزووتنه وه ی زانستی و ، ئه وته قه للا سیاسیا نه باس ئه که ین که کۆمه ڵه وریێکخرا وه کوردیه کا ن ، له پێنا وی هیوا ی پیرۆزی " یه کێتی ی نه ته وه ی کورد وو رزگا ری کوردستا ن" دا کردوویا نه .

— — — — —

9- مه به ست له جه نگی گشتی : جه نگی یه که می جیها نیه ، چونکه ئه م کتێبه پێش جه نگی دووه مـــــی جیها نی نووسرا وه . ( م )

# ته‌قه‌للای زانستیانه‌و کۆششی سیاسیانه‌

نیشتمان په‌روه‌رانی کورد ، ئه‌وانه‌ی له‌ تێکرای شۆرشه‌کانی کـورد دا سه‌رنه‌که‌وتن ، که‌ بۆ رزگارکردنی کورد بوون ، له‌ چنگی حوکمی تـورک و ، به‌ دیهێنانی سه‌ربه‌خۆیی کوردستان و یه‌کگرتنێکی پیرۆز ، هۆیه‌کانـی به‌ چه‌ند سۆنگه‌یه‌کی جیاواز و ، چه‌ند هۆیه‌کی ده‌ره‌کی دائه‌نێن له‌ به‌رئه‌مه‌ و ، بۆ گه‌یشتن به‌ هه‌مان مه‌به‌ستی پیرۆز بڕیاریان دا قـۆلـی لـێ هه‌ڵمالن و ، له‌ مه‌یدانی سیاسه‌ت وزانستیشدا کاربکه‌ن .

بۆئه‌مه‌ ، له‌ سالّی ـ ١٣١٥ ـ کۆچی ـ ١٨٩٨ز ـ دا ، بـڕیـار درا رۆژنامه‌یه‌کی کوردی ده‌ربچێ بۆ بلاّوکردنه‌وه‌ی په‌یـامـی کێشـه‌که‌ و ، ناساندنی گه‌لان وده‌وله‌تان ، به‌خواست وئاواته‌کانی ، ئه‌وه‌بوو مـیر ـ مه‌دحه‌ت به‌درخان ـ یه‌که‌مین رۆژنامـه‌ی کـوردی بـه‌نـاوی ـ کوردستان ـ ه‌وه‌ ده‌رکرد .

ئه‌وکاته‌ش کۆمه‌له‌یه‌کی کوردی وانه‌بووه‌ ، که‌ به‌پێی تێگه‌یشـتنـی ئێستا رێکخرابێت ، به‌لاّم هه‌ستێکی‌ها وبه‌ش زوربه‌ی نیشتمان په‌روه‌رانی دڵسۆزی له‌م لاو ئه‌ولای کۆکردبووه‌وه‌ ، تاجارجاره‌ کۆڕو کۆمه‌ڵ بگـرن‌و، باسی ئه‌وه‌ی تیا بکه‌ن ، که‌ئه‌رکی پیرۆزی نیشتمانیان چییه‌و ، چـی پێویسته‌ بیکه‌ن بۆ چاکه‌و خێری مافی نه‌ته‌وه‌ به‌ش خوراوه‌که‌یان له‌به‌ر ئه‌مه‌ رۆژنامه‌ی ـ کوردستان ـ زمانی حالّی ئه‌ونیشـتمـان پـه‌روه‌ره‌ دڵسوازانه‌و ، هۆی یه‌کخستنی ته‌قه‌للای هه‌مه‌جۆرو نیشانه‌ی یـه‌کێتی و سه‌ربه‌خۆیی نیشتمانی شیرین بوو .. کاتێ خاوه‌ن رۆژنامه‌و سـه‌رۆک نووسه‌ره‌که‌ی نه‌خۆش که‌وت ، میر ـ عه‌بدولره‌حمان به‌درخان ـی برای ، رۆژنامه‌که‌ی به‌رده‌وام له‌ ـ قاهیره‌ ـ و، دوایی له‌ ـجنیف ـ و ، پاشـان له‌ ـ فۆلکستون ـ ده‌رئه‌کرد . دوای ئاشـکرا کـردنـی ده‌سـتووری عوسمانی ـ یش دووباره‌ ئه‌م رۆژنامه‌یه‌ به‌سه‌رۆکایه‌تی مـیر ـ شـوره‌یا به‌درخان ـ له‌ ئه‌ستانه‌و ، پاشان له‌کاتی جه‌نگی گشتیدا له‌ ـقاهیره‌ ـ

دەستی کردەوە بە دەرچوون[1].

یەکەمین کۆمەڵەی گەورەی سیاسی کوردیش کۆمەڵەی "بەرزی پێشکەوتنی کورد" بووە، کە لە ساڵی - ١٩٠٨ ز - لە ئەستانە دروست بووە[2]. دامەزرێنەرە دیارەکانی ئەم کۆمەڵەیە، ئەم پیاوە کوردانە بوون: میرئەمین عالی بەدرخان، ژەنراڵ شەریف پاشا، شەهیدسەید عەبدولقادر، کەکەمالییەکان لە دیاربەکر لە سێدارەیان دا، دامادئەحمەد، زولکەفەل پاشا و، چەندانی تر.

هاوکات هەرلەگەڵ ئەم کۆمەڵە گەورەسیاسییەدا کۆمەڵەیەکی تری ئەدەبی دروست بوو، بەناوی "کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی زانیاری کوردان" و لە چەنبەرلی طاش - قوتابخانەیەکی بۆفێرکردنی منداڵانی کورد لە - ئەستانە - کردەوە[3].

---

1- رۆژنامەی کوردستان - لە ( 22ی نیسانی 1898ز ) لە قاهیرە دەستی بە دەرچوون کردووە، ژمارە ( 1 ) تا ژمارە ( 5 )ی لە قاهیرە دەرچووە، ژمارە ( 6 - 19 ) لە جنیف دەرچووە، ژمارە ( 20 - 23 )ی دووبارە لە قاهیرە دەرچۆتەوە، ژمارە ( 24 )ی لە - لەندەن - دەرچووە، ژمارە ( 25 - 29 )ی لە - فۆلکستۆن - ی باشووری ئینگلتەرە دەرچووە، ژمارە ( 30 - 31 ) دووبارە لە جنیف دەرچۆتەوە... واتە بە هەموو ژمارەکانی ( 47 ) مانگ و ( 22 ) رۆژی خایاندووە و، لە بریتی ئەوەی لە و ماوەیەدا ( 96 ) ژمارەی لێ دەرچێ، ( 31 ) ژمارەی لێ دەرچووە، هەموجارێکیش دووهەزار دانەیان لێ ناردۆتە وڵات و، بەخۆڕایی بەسەر خەڵکا بەشویانەوە.

ئەم رۆژنامەیە ( 26 ) ژمارەی لە کتێبخانەی دەوڵەتی لە - ماربورگ - ە، کە کاتی خۆی (د. کەمال فوئاد ) بە نوسینێت بڵاوی کردۆتەوە. ( 18 ) ژمارەشی لەوانەی ساڵی ( 1899 ز ) وبە تەواوە چاپکراون لە کتێبخانەی نیشتمانی - ئەنقەرە - ن. ژمارە ( 5 ) و لاپەڕە ( 3 ، 4 )ی ژمارە ( 3 ) شی لە کتێبخانەی کۆڕی زانیاری کورد - ەن. بڕوانە - رابەری رۆژنامەگەری کوردی - جەمال خەزنەدار - بەغدا - ساڵی 1973ز - ( م )

2- دکتور جەبار قادر - دەربارەی ئەم کۆمەڵەیە ئەڵێ: "ئەم کۆمەڵەیە لە رۆژی 25ی ئەیلولی ساڵی - 1908 ز - دا خۆی بە خەڵکی ناساند، لەم رۆژەدا یانەی کۆمەڵەکە لە ئەستەموڵ کرایەوە و نزیکەی (500) کەس لە ئەندام و میوان، لایەنگری گەرمی خۆیان لە رژێمی تازە دەربڕی" هەروەها ئەڵێ: "لەم کۆبوونەوەیەدا نوێنەری شاری موش - رەشید بەگ - وتاری خوێندۆتەوە". گۆڤاری - کاروان - ژمارە 32، ل 9 ( م )

دیسان دەربارەی ئەم کۆمەڵەیە ئەڵێ: "هەنگاوێکی گرنگی کۆمەڵەی ناوبراو بڵاوکردنەوەی ئۆرگانی تایبەتی خۆی بوو، کە رۆژنامەی ( کۆمەڵەی هاریکاری و پێشکەوتنی کوردان )ی دەرکرد، ئەم رۆژنامەیە لە سەرچاوەکاندا تەنها بە رۆژنامەی - کورد - ناوی هێنێت ... یەکەم ژمارەی رۆژنامەی - کورد - لە ( 9 )ی تشرینی دووەمی ساڵی 1808 ز - دا بڵاوکرایەوە، خاوەنی ئەم رۆژنامەیە - توفیق بەگ - بوو ( پێم وایە پیرەمێردی شاعیرە ) سەرنووسەری ئەحمەد جەمیل پاشا بووە، کە لە بنەماڵەی جەمیل پاشای دیاربەکرە و برای ئەکرەم و، قەدری جەمیل پاشایە - هەمان سەرچاوەی پێشوو ( م )

بەڵام دوای ئەوەی - ئیتیحاد - یەکان[4] دەستیان بەسەر کاروباری دەسەڵاتدارێتی عوسمانیدا گرت و، ئیدارەیەکی ستەم بەخشیان دامەزراند و، لەژێر پەردەی دەستوور و دیموکراتیدا ،دیکتاتوریەتێکی سەختیان چەسپاند ، بووە هۆی کلۆم کردنی ئەم هەردووکۆمەڵەیە پێکەوە و ، داخستنی قوتابخانەکەش . کۆمەڵەی - بەرزی و پێشکەوتنی کوردان - یش ناچاربوو چالاکی خۆی بەرێگای نهێنی وشێوە شاراوە ، بنوێنێ .

لەساڵی - ۱۹۱۰ - یشدا لەسەرپێ سپێری وهاندانی - خەلیل خەیالی موطەکی - لەئەستانە ، کۆمەڵەی - هێڤی - ی کوردی لەم قوتابیانە دروست بوو : عومەرقەدری ئال جەمیل پاشای ریش سپیانی دیاربەکر ، فوئاد تەمۆبەگی وانلی ، زەکی بەگی قوتابی خوێندکاری کشت وکاڵ لەئەستانە .

چالاکی ئەم کۆمەڵەیە و پەیڕەوکردنی بەرنامەکانی ، تابەشداربوونی تورکیا ، لەجەنگی گشتیدا بەردەوام بوو، ئیتر بەهۆی رۆیشتنی گشت ئەندامەکانیەوە ، بۆ بەرەکانی جەنگ ، لەچالاکی کەوت .

دوای ئەوەی مستەفا کەمال ئەستانەی گرتەوەدەست ، دووبارە ئەم کۆمەڵەیە کەوتەوە چالاکی نواندن و گرنگترین کارەکانی ئەم کۆمەڵەیە ،

---

3- ئەم قوتابخانەیە لەگەڕەکی ( دیوانلی ) لەجادەی خواجەپاشا - کرایەوە ،ناوی قوتابخانەی دەستوری لێ نرا ، پرۆگرامی خوێندن لەم قوتابخانەیەدا ، پەیڕەوی پرۆگرامی قوتابخانەکانی تری تورکیای ئەکرد ، کەسەربەوەزارەتی فێرکردن بوون . ئەم وەزارەتەش ئەوکاتە لەلایەن - ئیسماعیل حەقی باباں - ەوە ، بەڕێوە ئەبرا ، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەش - عەبدولرەحمان بەدرخان - بوو ، لەسەرەتادا ژمارەی قوتابیەکان ( 30 ) خوێندکاربوون ، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم ژمارەیان زۆربوو ئەم قوتابخانەیە بەیارمەتی کوردە دەوڵەمەندەکان بەڕێوەئەچوو - سەرچاوەی پێشوو (م)

4- کۆمەڵێکی تورکی تورانی باوەڕن ، بەتاوبانگن لەوەدا کەبەکوێرانە لەهەموو شتێکی تورک داکۆکی ئەکەن . لەگەڵ پیاوانی ئەم جولانەوەیە ، سێ قولێە شۆڤینیەکە : ئەنوەرپاشاو طەلعەت پاشا و جەمال پاشای خوێن ڕێژبوو ، ئەمانە کودەتایان لەسولتان عەبدولحەمیدی دووەم کرد و ، لەساڵی ( 1908 ز ) دا دەستوریان بڵاوکردەوە ، لەسەرەتادا داوایان ئەکرد کەسنوورێک بۆکردەوەکانی سولتان عەبدولحەمید دابنرێت ، کەبەخوێن ڕێژی ناوی دەرکردبوو، وەگەلەکانی ژێرکێفی عوسمانی مافی خۆیان وەربگرن . بۆماوەیەکیش ئەو گەلانەیان چەواشە کرد ، بەڵام هەرکە ئیش وکار کەوتە دەست خۆیان ، دەست بەجێ لەهەموو پەیمان وگفتێکیان پەشیمان بوونەوەو بەتاگرو ئاسن وەڵامی ئەو گەلانەیان دایەوە ، کەداوای مافیان ئەکرد . ( م )

ئەوە بوو رۆژنامەیەکی کوردی بەناوی - رۆژی کورد - ەوە لە ئەستانە دەرکرد ، کە زمانی حاڵ و بڵاوکەرەوەی بیروڕاکانی کۆمەڵە بوو .

هاوکات هەر لە ئەستانە بەڕێزان : هەمزە ئەفەندی و،ممدوح سەلیم بەگ و، کەمال فەوزی بەگ - کەلەم دواییەدا لە دیاربەکر لە سێدارە درا ، رۆژنامەی - ژین - ی کوردیان دەرکرد . دوای وەستاندنی جەنگیش میر - ثورەیا بەدرخان - لە - قاهیرە - " کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد"ی پێکەوەنا . هەروەها ئەم بەڕێزانە ، لە ئەستانە کۆمەڵەی " بەرزێتی کوردستان " یان پێکەوەنا :

- ئەهیدی نیشتمان ، خوالێ خوش بوو، سەییدعەبدولقادر ئەمین عالی مراد ، محەمەد عەلی ، خلیل رامی ، کامەران - ی کوڕو کوڕەزای میربەدرخانی گەورە ، فوئادپاشا ، حیکمەت ، حسین ، شوکری ، فوئاد محمود ، عەلی ، کەلەبابانەکانە - سەیید عەبدوللا ، رەمزی بەگی خەربوتی ، ئەکرەم بەگی جەمیل پاشازادە ، نەجمەدین حسین، ممدوح سەلیم ، حەسەن حامید ، فەریقەدکتور شوکری محمد ، حسین عەونی - نوێنەری پێشووی خەربوت - ، محمد - ی نوێنەری پێشووی مەلاتیەو ، ئەمین زەکی ، میرئالا خەلیل بەگی دەرسیملی ، محمود نەدیم پاشا ، ژەنراڵ مستەفا پاشای شاری سلێمانی ، ژەنرال حمدی پاشا ، قائمقام محمد ئەمین بەگ - ی سلێمانی ، شێخ عەلی شیرۆلی ، سەیید شەفیق ئەفەندی خیزانی و چەندانی تر .

دوای ئەمەش ئەم بەڕێزانە کۆمەڵەی - رێکخراوی کۆمەلایەتی کوردستانی - یان دروست کرد : میرئەمین عالی و، جەلادەت و کامەران بەدرخان و، کەمال فەوزی و ، ئەکرەم جەمیل پاشازادەو،دکتور شوکری محمدو ، مەمدوح سەلیم و، چەندانی تریش .هەرلەگەڵ ئەم کۆمەڵەیەدا ، کۆمەڵەیەکی تریش لە ئەستانە ، بەناوی " پارتی نەتەوەی کورد " ەوە دروست بوو .

ئەم کۆمەڵانە هەموویان ، کاروچالاکیان لە ئەستانە هەر..بەردەوام بوو، تالەشکری کەمالییەکان تێی چوون . دوای ئەمەش لەگەلێ لە ولاتانی دەرەوە چالاکیان نواندەوە ، سەدان لق وبەشی تریان ، لە بەشەکانی

تری کوردستاندا هه بووه .

له م دوا ییه دا ئه م کۆمه لّه و، ریکخراوانه ، هه موویان دوای دروست بوونی کۆمه لّه ی خۆیبوون - ی کوردی ونیشتمان په روه ر خـــۆیا نیـــان هه لّوه شانده وه و، هه مووئه ندامه کانیان چوونه ئه م کۆمه لّه یه وه کـــه بـــه ته نیا له کاردا یه و به م جۆره هێزه سیاسیه کانی کورد، له ده وری ئـــــه م کۆمه لّه یه گردبوونه وه .

— — — — — — — —

# کورد لە دوای دەستووری عوسمانی

لە مانگی تەمووزی سالّی ـ ١٩٠٨ ز ـ دا دەستووری عوسمانی ئاشکرا کراو، ئەو ـ ئیتیحاد ـ یانە دەستیان بەسەر دەسەلاّتداریتی عوسمانیدا گرت ، کەناونران : پالّەوانی کودەتای عوسمانی و لە ناوەوە و دەرەوەی ولاّتدا وئاشکرا ئەوەیان بلاّوئەکردەوە ، کە هەموو ئەوبەرنامە سیاسی و ، ئاوەدانی و چارەسەرکردنی ئیداری و ئەوشتانەی تر، کە پەیمان و بریاریان داوە بیکەن ، هەموو جێ بەجێ ئەکەن . ئەمەش بووە هۆی ئەوەی سیاسەتی گشتی ، لە ناوەوە و دەرەوەی ولاّتدا سڕببێ . .تەنانەت ئەورووپاش بڕوای بەم پەیمانە بۆشانەکرد، بەلّگەی ئەوەی جێ بەجێ کردنی ئەوبڕیارانەی لەکۆنگرەی ـ ریوال ـ REVAL ـ دا ، دابویان هەموویان راگرت ، چونکە رۆژنامەکانی ناو ولاّتیش دەستیان کرد بە بلاّوکردنەوەی وتاری بریقەدار ، دەربارەی برایەتی عوسمانی ویەکسانی لە نێوان موسلّمانان و تورک و، ناتورک و ، گەلانی عوسمانیدا ، بۆیە ئەم پڕوپاگەندەیە کاریکی زۆری لەوخەلّکەکرد، کەڕقیان ، لە پیاوانی دەسەلاّتداریتی عوسمانی ئەبووەوە ئەوکینەو ناجۆریەش لە نێوانیاندا بوو نەما و ، خەلّکی بەهەموو ماناى وشەوە چاوەڕوانی ئەوە بوون لە سەر دەستی نەوەکانی مەغۆل دا ! دەولّەتێکی دیموکراتی و هاوچەرخ دابمەزرێ !

بەم جۆرە پێیان وا بووفریشتەی سەربەستی ودیموکراسی راستەقینە لەو پیریژنە دڕندە مەغۆلییە لەدایک ئەبێ ، کەلەدێر زەمانەوە بەدکارییەکانی ئاشکرا ببوو .

بەلاّم ئەم تورانیانەی کە نەوەی مەغۆل وتەتەرن و، لە پال پەردەی تەنکی شارستانیەتدا ، خۆیان حەشار دابوو، وەکجارانی جاران شەویان ئەدایە دەم رۆژ ، بۆسازدانی پیلانی دوزەخیانەو، ریگای شەیتانی و خوێناوی گرتنەبەر، بۆپاکودانی هەموو ئەندامانی سەربە عوسمانی و

نغرۆکردنیا ن ، به شێوا ندن وئا وا ره کردن و کوشتنیا ن و، تا ئێستا ش بانگی بانگی ئه وه را دێلن که پا به ندن به سیا سه تی تا زه ی نیشتما نییه وه و ، ئه ما ن ـ وا ته : ئه وتورکه لاوا نه ی که با سی خۆیا ن وا ئه که ن ، گوا یه قوتا بیا نی ئه ورووپا ی نوێ ـ ن ، ئه وسیا سه ته عوسما نییه ئیسلامیه ئه گۆڕن، به سیا سه تی تۆرا نی تورکی که ، تا ئه وکا ته ده سه لاتدا رێتی عوسما نییه کا ن و، به تا یبه تی تا سه رده می سولتا ن عه بدولحه مید، په یڕه و ئه کرا ، به لام چ جیاوا زیه کی ئه وتۆ ، له نێوا ن ئه و دوو سیا سه ته با سکرا وه دا نه بوو، له به رئه وه ی ئه م ده سه لاتدا ریه ی تورکی عوسما نی ، له رۆژی دروست بوونیه وه ، تا دوا سه رده می سولتا ن عه بدولحه مید ، درێغی له شێوا ندن و، تێکه ڵ کردنی ره گه زی نا تورک دا نه کرد ، ئه گه ر موسلما ن بووبن ، یا ن نا موسلما ن ، بۆ به تورک کردنیا ن و به کا ر هێنا نیا ن بۆمه به ستی نه ته وه یی و ، جێ به جێ کردنی شا ره زووه سه ربا زییه مه غۆل ئا سا ییه کا نیا ن و، له هیچ ده ورا نێکی مێژووی چا که کا ریشدا ـ ئه گه ر مێژووی چا که کا رییا ن هه بێ ! ـ له جێ به جێ کردنی ئه م نیا زه سته م به خش و ، خۆویسته تورکیا نه دا ، زیا تر هیچی تریا ن نه بووه ، له به رئه وه عوسما نیه کا ن هه رته نیا دا نشگه یه ک بوون ، بۆ دزۆ و ، روپا ما یی ، بۆبه رژه وه ندی تورک و، دا پۆشینی نیا زه به ده کا نیا ن ، له ئا ستی ره گه زی نا تورک دا و ئه وپه ڕی زیا ن پێ گه یا ندنیا ن ، به لام به ڕێگا و شێوه ی جیاوا ز.

ئه م نیا زه هه رئه و نیا زه یه که ـ ئیتیحا د ـ یه کا ن ته قه للا ی بۆ ئه ده ن و ، ئه و په رده یه یا ن دڕیوه که پێشتر سولتا نه کا ن به نا وی ئیسلام و ، یه کێتی ی عوسما نیه وه خۆیا ن پێ شا ردبۆوه وه ، به ئا شکرا بانگی ئه وه ئه ده ن ، که پێش هه مووشتێک تورکن و، حکومه ته که ش حکومه تێکی تا ن و پۆ تورکیه و ، ئه بێ گه لیش هه مووی تورک بێ و، ئیمپرا تۆریه تی به سه رچووی عوسما نیش ئه وپه ڕی که مته رخه می کردووه که تا ئێستا به تورک کردنی نه ته وه نا تورکه کا نی پشت گوێ خستووه ، ئه ما ن به وپه ڕی چا وقا یمی وجه ربه زه ییه وه ، ئیمپرا توریه ته کۆنه که به گیا نی نیشتما ن په روه ری و ، خوێنی خه ستی تۆرا نیه وه نوێ ئه که نه وه ، به لام نیشتما ن

پەروەریێتی ئەم تورکە لاوانە، لەسەرشێوەی ئەو نیشتمان پەروەریە نەبوو، کەلەجیهاندا ناسراوە، بەڵکو ئەیویست ئیمپراتورەتی عوسمانی لەمپەڕەوەی تائەوپەڕی بکات بەتان وپۆ تورک و، لەتورک زیاتر، کەسی تر بۆی نەبێ هەناسەی تێدا بدات و، لەنەتەوەو زمان و ژیانی تورکیش زیاتر، دان بەهیچ شتێکی تردا نەنرێ و، ئەوەیشی تورک نەبێ، ئەبێ نۆکەری تورک بێ و، سووتەمەنی بێ بۆ ئەو شەڕ و ناکۆکیانەیان، کەوەک خۆویستی و چاوبرسیتیان، هەرگیز دوایی نایەن، بۆسەرگرتنی ئەم نیازەش، تاتەواو پەیرەوبکرێ، زۆر بە چەرداوەرویی و، چاوقایمییەوە، ئەم دوو بەندەیان دانابوو:

١- تواندنەوەی ئەوانەی لەرەگەزی ترن و، ئەتوانرێ تێکەڵ رەگەزی تورک بکرێن، تا بەتورک بووەکانی تریشیان پێ بشێوێنرێ.

٢- چەوساندنەوەو توندوتیژی وبێ پەرنەیی بگیرێتە بەر بۆ پاکتاوانی ئەورەگەزە ناتورکانەی ناتوانرێ، بەهیچ شێوەیەک، بکرێن بەتورک.

ئەم دووبنەمایەش لەلایەن گەلی تورکەوە، هیچ جۆرە بەرەنگاریەکی نەکراو، لای سەرتاپای تورکەوە قبوڵ کران و تەگەرەوکۆسپیان نەهاتە رێ و کاتیشی نەویست بۆقایل کردنیان، بەڵکو ئەم دووبنەمایە بوونە بەشێک لەکۆڵەکەکانی ئایینی نیشتمان پەروەریێتی تورک، لەبەرئەوە ئەم دوو بنەمایە، ئەم گەلە عوسمانیانەی گرتەوە: عەرەب، ئەرمەن، ئەرنوط، رۆم، چەرکەس و، کورد.

بەڵام تواندنەوەی عەرەب، لەناوتورکداو، شێواندنیان، کارێکی سەخت بوو، چونکە ئەم گەلە بەخشندە خاوەن شارستانیەتەگەشەکردووە و، ئەو چوونەناو وڵاتەبەرینانەی بەهۆی ئایینی ئیسلامەوەپێی فراوان بوون، هەرلەخۆرهەڵاتەوە تاخۆرئاوا، وای لێ کردووە تائێستاش وەک -رۆما- بێت بۆخۆرهەڵات و زمانە عەرەبیە پاکەکەیشی، وەک لاتینی وایە، بۆئەوروپا.. ئەی ماوەی شەش سەدساڵ نیە، ئیمپراتوریەتی عوسمانی، بارێکی گرانە بەسەر شارستانێتی ئیسلام و پێشکەوتنی عەرەبەوە، هەرلە زمان و یاساو سیاسەتەوە، تا کەلتوور- یان؟!

ئیمپراتوریەتی عوسمانیش چونکە هەرئاوە ژووکردنەوەیەکی دزێـــوی، ئیمپراتوریەتی گەشەکردووی عەرەبی بوو، بۆیە جێ بەجێ کـــردنـــی سیاسەتی تواندنەوەی ئەوعەرەبانەی کە ژمـارەیان لە قـەڵـەمـڕەوی عوسمانیدا بیست ملێیون ئەبوو، لەبەرئەوە لەناوبردنیان هەرواکارێکی ئاسان نەبوو.

بۆیە بڕیاریان دا، وازلەنەتەوەی عەرەب بهێنن، ئەوانەی لـــە چەند وڵاتێکی پێکەوەنووساوی باشووری قەڵەمڕەوی عوسمانیدا ئەژین و، رەگەزی تریان کەمتر تیایەو، پشت گوێیان بخەن و، هەروا بـە کـۆت و پێوەندی داگیرکردنەوە بیان هێڵنەوەو، سیاسەتی ئیمپریـالیسـتانەی تۆرانی - یان بەسەردا بسەپێنن، تابەروبووم و سامانیان تالان بکەن و رۆڵەکانیشیان لەبەرەکانی شەڕی ناوچەدوورەکاندا بخـەنە ژێـــر بێگاری شەڕەوەو، بیانخەنە دەست بیانەوە، ئەوانیش بەئامێری تازە و دۆزەخیانەی ئەورووپایی و تفاقی زۆری ئیمپریالیستانە، تــــالاوی ئازاریان پێ بنۆشن، تاگەشەنەکەن وشارستانێتی عــەرەب نـەبێتـــە کۆسپێک لەرێگای جێ بەجێ کردنی بیری گورگانەی تۆرانی دا..

بەڵام ئەرمەنە کلۆڵەکان، ئەوەهەر ســەرتۆپی ئەونەتەوانە بــوون، کەبڕیاری لەناوبردن و نغرۆکردن، ئەیگرتنەوە. هەمووکەسێکیش ئاگای لەوەهەیە چۆن سەرئەبڕدران و، چۆن لەناو ئــەبــران. بــــەڵام ئەرنوط - ەکان، بەسۆنگەی جەنگی - بەلقان - ەوە، لەژێـــر چـنـگـی حوکمی تورک و، کوشتاری تورانیەوە رزگاریان بوو.

ئەوکوشتارەش کەلەئەرمەنیان کردو، دەنگدانەوەیەکی باشی نەبـوو لەجیهاندا، تورکەکانی والێ کرد لەوەبسەڵمێنەوە کەئەم کارە دووبـارە نەبێتەوە، لەبەرئەمە رۆمیەکان چەندسەدان کەسێکیان لێ رزگاربـــوو، ئەوانی تریان، یان هەڵهاتن یان دوای جەنگی یەکەم، فـڕێ درانـــە ئەودیو سنوورەوە، تا پەیمانی - لوزان - هاتەگۆڕێ و، راگوێزرانـــەوەی ئەوانی تریشیان بەپەسەند زانی.

- چەرکەس - یش، ئەگەرچی ژمارەیان لەتورکیادا ئەوەندەنەبوو لە زۆرسەردەمی جیاجیاشدا خزمەتی تورکیان کردبوو، بەڵام هەرلـــە چـنـگ

ئه‌وسیاسه‌ته‌ توندە تۆرانیه رزگاریان نه‌بوو، سه‌ره‌رای ئه‌وه‌ش که‌ ئه‌م ره‌گه‌زه، ئالوگۆڕێکی زۆری به‌سه‌ر ، سه‌روسیما و قه‌ڵافه‌تی ره‌گه‌زی تورکی مه‌غۆلیدا هێنابوو، له‌جوان کردنی چاوی به‌قوڵاچوویان و، رووم‌ه‌تـــی به‌رزی ئه‌ره‌پۆقیویاندا ، که‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌ما نه‌شدا چالاکــی ئـه‌م ره‌گـه‌زه شوێنه‌واری له‌تورکیادا ، هه‌رنیار نه‌ما .

پاشان هاته‌سه‌رکوردو، تورکیش هیوای زۆریان به‌وه‌بوو که‌ئه‌توانـن به‌ئاسانی دانیشتوانی کوردستان ، له‌ناوتورکدا بتوێننه‌وه ، به‌تایبه‌تـی ئه‌وانه‌ی که‌له‌هه‌ندێ شاری گه‌وره‌ی کورددا زمانی تورکییان تێدا بڵاوه و ، به‌هۆی ئیداره‌ی خراپی تورکه‌وه ، به‌درێژایی سه‌دان ساڵ ، تووشـی دواکه‌وتن و سه‌رگه‌ردانی بوون ، له‌رووی شارستانێتی تازه‌وه ، چونـــکه هه‌موو بیرکردنه‌وه‌یه‌کی تورک ، له‌کوردستاندا ، هه‌ربۆئه‌وه‌بوو بیکـا ته سه‌ربازگه‌یه‌ک بۆ سوپاگه‌لی خۆی .

— — — — — —

# لەکاتی جەنگی گشتیدا :

هەرکە یەکەمین بۆمبای شەری گشتی تەقی ، ئیتر تورکیش دەستی کرد بەجێ بەجێ کردنی ئەوبەرنامە شەیتانیەی ، کەلەکاتی ئاشتی دا ئامادەیان کردبوو بۆ بەدیهێنانی بیری تۆرانی و پاکۆدانی رەگەزی ناتورک .

لەبەرئەوەی کۆمەڵە خەڵکێکی زۆری وا ، لەبەردەم تورکدا بوون کە بریاری پاکۆدان و لەناوبردن نەیئەگرتنەوە ، بەڵام بۆئەوەی لەرەگەزی تورکدا بتوێنەوە ، ئەبوایە پەرش وبڵاوبکرێنەوە و، ئاوارەی ئەوشوێنە دوورانەی وڵاتی تورک بکرێن ، کەئاستی کۆمەڵایەتی ورەوشتیان نزمە و ، بەرەوسەرنگونی ئەچن و، لەژێر باری پەرێشانی ونەمان و پەتای چەندان نەخۆشیدا ئەناڵێنن ، کەبەزۆری لەناوچەکانی تورکدا بڵاوەو، خوا وڵاتی کوردانی لێ پاراستووە ، وەک : سوسەنگ ، وسیل و،گرانەتاو ، چەندان نەخۆشی تر .

ئەوکۆمەڵەخەڵکەش هەرکوردبوون ، کەئەوکاتە ژمارەیان لەتورکیا دا ئەگەیشتە پێنج ملیون و، تارادەیەکی زۆریش ،توانا و،تەندروستی و ئازایەتی بێ وێنەی زگماک و، زیرەکییەکی بەرزیان هەیە .

کەواتە ئەبوایە پێنج ملێون کوردی بێ تاوان ، لەنیشتمانەکەی خۆیانەوە ، بەناوچە دوورەکانی وڵاتی تورکدا پەرش وبڵاو بکرێنەوە و بخرێنە تەک رەگەزی تورک ، تابشێوێندرێن و، بکرێن بەتورک .

بۆئەمەش سوڵتان ـ محمدرەشاد ـ ی پێنجەمیان راسپارد ،تا فەرمانێکی چەندبەندی یان بۆمۆربکات ، رێگابدات بەسازدانی ئەم سیاسەتە تەڕن کارە .

ناوەرۆکی ئەم یاسایە ، بریتی بوولەوەی : هەرچی کوردە ، لەوڵاتی خۆیانەوە ، بەوڵاتی تورکدا ئاوارەوپەرش وبڵاو بکرێنەوە ، بەمەرجێ ژمارەی ئەودوورخراوەو ، راگوێزراوانە ، لەهەرشارێکی تورکیدا زیاتر

نه بێ له ، له سه دا پێنجی (٥٪) دانیشتووه تورکه کان . ئه ومه رجه شی له گه ڵدا بوو ، که ئه بێ سه رۆک خێڵ و ناودارو قسه ڕۆیشتووانی کورد ، له شارو مه ڵبه نده تورکیه کاندا ، به ته نیا ده ست به سه ربکرێن و ، ده ست و پێوه ندو ، پیاوانی خێڵ و ، داروده سته کانیان ، له گونـــــدی دوورو دا بنرێن ، تا په یوه ندی له نێوان خۆیان وسه رۆکه کانیاندا روونه دات .

به م جۆره گه لی کورد ، له نێوان گه لی تورکدا په رش و بڵاو ئه کرێته وه ، تا دوای ماوه یه کی که م بتوانرێ زمانی کوردی و ، سه رتاپای کۆڵه که کانی نه ته وایه تی و ، داروباری میللی ، له کورددا گوم بکرێ و ـ خوانه کا ـ دواشوێنه واریان له سه ر لاپه ڕه ی زه میندا نه مێنێ ، بۆیه هه ر به ڕاستی حکومه تی ئه وسه رده مه ده ستی کردبه په یڕه وکردنی ئه م گه ڵاڵه یاسایيه .

له دۆسیه ی به ڕێوه به رایه تی راگوێزراوه کاندا ، که بۆئه م به رنامه یه کاری ئه کرد ، ژماره ی ئه وکوردانه ی له کوردستانه وه راگوێزرانه وه بۆ ولاتی تورک ، گه یشته (٧٠٠ ر ٠٠٠) حه وت سه دهه زارکورد ، جگه له وه ی که هه ندێ دۆسیه ی ئه وه ده رئه خه ن ، که سه روشوێنی ئه وکوردانه ی به زۆر راگوێزراون ، لای به ڕێوه به رایه تی باسکراو ، هه ر به ته واوی نادیاره ، به ڵام لای ئێمه ی کورد نادیارنیه .. چونکه به شێکی زۆر زۆری ئه وخه ڵکه کڵۆڵه راگوێزراوانه هه ربه ده م رێگاوه ، سه رمای سه ختی زستان و ، ماندووبوون و ، برسێتی ، کوشتنی ، به شێکی تریشیان ، پێش ئه وه ی بگه نه شوێنی بۆڕاگوێزراو ، تورک کوشتنی !

والێره دا هه ربونموونه ، ئاماره یکی بچووکی ژماره ی ئه و کورده راگوێزراوانه نیشان ئه ده ین ، که له ناوچه دووره کانی خۆرهه ڵاته وه ، ناچارکران رووبکه ن بۆخۆرئاوای ئه نادۆڵ و ، ناوه ڕاستی ... بۆئه وه ی خوێنه ر ئاگاداری هه ندێ لاپه ڕه ی ئه وکۆچ پێ کردنه بێ ، که باسکرا ، ئه م ئاماره له ڕۆژنامه ی ـ سه ربه ستی ـ تورکی ژماره ـ ٤٨١ ـ ی ٣٠ی نیسانی سالی ـ ١٩١٩ز ـ وه رگیراوه :

ژما رە ی کوردی کوچ پی‌کرا و...
لە پا ریزگە ی ـ بوردور ـ لە ئە نا دول دا :

| ژما رەی خە لک | نا وی کومە لە کا ن |
| --- | --- |
| 300 | دا رودە ستە ی عە بدوللائا غـا ـ لـــە دەم سیپا نـی ـ وا ن ـ |
| 190 | دا رودە ستە ی قا سم ئا غا ـی ـ وا ن ـ |
| 225 | شیخ هە مزە ئا غا ـ ی ـ وا ن ـ |
| 130 | محمدرە شیدئا غا ـلە زا نا یا نـی بە تلیس ـ |
| 150 | ئە حمە دین ئە فە ندی ـ لە دە م ســـیپا نـی ـ موش ـ |
| 150 | جە عفە ر بە گ ـ ی موش |
| 100 | مستە فا بە گ ـ ی موش |
| 270 | قوتا س ئا غا ـ ی ـ وا ن ـ |
| 130 | ئیسما عیل ئا غا ـ ی ـ وا ن ـ |
| 100 | ئە حمە د ئا غا ـ ی ـ وا ن ـ |
| 100 | کا میل ئا غا ـ لە ئە فسە را نـی خیلە کی |
| 60 | یوسف ئا غا ـلە دە م سیپا نـی ـ وا ن ـ |
| 70 | جوندی ئا غا ـ لە دە م سیپا نـی ـ وا ن ـ |
| 100 | جە عفە رئا غا ـ ی ـ وا ن ـ |
| 100 | ئە حمە دئا غا ـ لە سە روکە کا نـی بە تلیس |
| 500 | خیزا نە پە رش و بلاوە کا ن |
| 2 ,675 | هـە مـووی |

## ژماره ی کوردی کوچ پی‌کراو...
## له پاریزگه ی - ئسپارته - ی ئه نادول دا :

| ژماره ی خه لک | ناوی کومه له کان |
|---|---|
| 475 | داروده سته ی نه سره دین مسته فا ـ له ده م سیپانی به تلیس ـ |
| 150 | ره زوان ئاغا ـ له ده مسیپانی به تلیس ـ |
| 360 | یوسف ئاغا ـ له یوزباشی خیله کی و ، له ده م سیپانی - وان ـ |
| 130 | عه ره ب ئاغا ـ له ده م سیپانی ئه رزه روم ـ |
| 200 | شیخ عه بدالرحمان ئه فه ندی له ده م سیپانی ئه رزه روم |
| 80 | مه لا محمدئه فه ندی ـ له ده م سیپانی ـ موش ـ |
| 80 | مه لا سه عیدئه فه ندی ـ له ده م سیپانی به تلیس ـ |
| 125 | داروده سته ی گولشه ن ئاغا له ده م سیپانی به تلیس . |
| 270 | داروده سته ی سه عدون ئاغا ـ ی به تلیس |
| 90 | داروده سته ی یاسین ئاغا ـ له ده م سیپانی ـ وان ـ |
| 110 | مه لا محمدئه فه ندی ـ له زانایانی به تلیس. |
| 2 ,070 | هه مووی |

ئه‌مه‌و کاری راگوێزان، به‌درێژایی ماوه‌ی جه‌نگی گشتی و، به‌هه‌موو ناشیرینی و، توندوتیژییه‌وه‌، هه‌ربه‌رده‌وام بوو، تاپه‌یمانی شه‌ڕ وه‌ستاندنی - موندرس - گیراو، مزگێنی به‌مرۆڤایه‌تی سزا چه‌شتوودا، که‌تورکیای زۆردار و سه‌رسه‌خت، بۆئێجگاری له‌ناوچووه‌، به‌مه‌ش کاره‌ پڕشووره‌ییه‌کانی داروده‌سته‌ی تۆرانی، بۆماوه‌یه‌کی کاتی ی، راوه‌ستا.

— — — — —

## دوای ڕاگیرانی شه‌ڕی گشتی

شه‌ڕ راگیرا و قاره‌مانانی ئێتیحادی - هه‌ڵهاتن وحکومه‌تێکی شێوه‌ مام ناوه‌ندی له‌ - ئه‌ستانه‌ - پێکهات و، گه‌لانی سته‌مدیده‌و، گه‌لی کوردیش له‌گه‌ڵیاندا، تاهێکیان پیاهاته‌وه‌، به‌مه‌ش کۆمه‌ڵه‌ کوردییه‌کانی ئه‌ستانه‌و،ٌهی شوێنانی تریش، که‌وتنه‌وه‌ چالاکی نواندن بۆسه‌رخستنی کێشه‌ی نیشتمانی کورد، چالاکیه‌کانیشیان به‌و گیانی چاکه‌یه‌ هاندرابوو، که‌بیروڕا دڵگیرو شیرینه‌کانی - ویلسون - دروستی کردبوو.

بۆیه‌ ئه‌م کۆمه‌ڵانه‌، به‌ره‌سمی داوای سه‌ربه‌خۆیی کوردستانیان کرد و، سه‌ردانی ئه‌ولیژنه‌یه‌یان کرد، که‌ده‌وڵه‌تانی هاوپه‌یمان، له‌ئه‌ستانه‌ - بۆکاروباری - داگیرکردن - یان پێکهێنابوو، چوونه‌لای ئه‌و لیژنه‌ ئه‌وروپایی و ئه‌فریقیایانه‌ش که‌ پێکهێنرابوون بۆڕاوه‌رگرتنی ئه‌و گه‌لانه‌ی له‌قه‌ڵه‌مڕه‌وی عوسمانی ده‌رئه‌چن. ئه‌م کۆمه‌ڵه‌ هه‌رته‌نیا به‌م ته‌قه‌للا سیاسیانه‌شه‌وه‌ دانه‌که‌وتن، به‌ڵکو چالاکیان له‌وه‌شدا نواند، که‌لقیان له‌ناوخۆی کوردستانیشدا کرده‌وه‌و، لیژنه‌یان له‌سه‌رانسه‌ری شوێنه‌دووره‌کانی کوردستاندا پێکهێناو، ده‌نگی داواکاریان بۆ سه‌ربه‌خۆیی کوردستان به‌رزکرده‌وه‌.

تورکیش که‌پێی وابوو به‌هۆی - ئه‌ڵه‌مان - ه‌وه‌له‌جه‌نگی گشتیدا سه‌رئه‌که‌ون، بۆیه‌ تینوێتیان به‌خوێن پاراوکردو، شمشێریان له‌ ئه‌رمه‌ندا ڕاداو زۆربه‌دل ڕه‌قی وسه‌مه‌ره‌وه‌، ملیۆنێک له‌وبێتاوانه‌یان

کوشت . بەڵام کە لە جەنگدا دۆڕاندیان ، دەنگوباسی کوشتاری ئەرمەن لە ئەوروپاو ، لە ئەمەریکاو ، سەرتاسەری دنیادا بڵاو بووەوە ، بۆیە ترسی ئەوەیان لێ نیشت ، کە دارو لەلە ، بۆ تاوانەکانیان دائەنرێ ، لەبەر ئەوە دەستیان کرد بە پێکهێنانی دادگای تایبەتی ، بۆ سزادانی توندی ئەوانەی تاوانیان لەگەڵ ئەرمەندا کردووە . هەربەراستیش هەندێ کەسی سەربە - ئیتیحادی - یان بە سەرزاری ، دابەدادگا ، بۆ ئەوەی بیانکەنە هۆیەک بۆپاک کردنەوەی خۆیان وحکومەتەکەیان ، لەو کارە دڕندانانەو ، تا بە ئاشکراش ئەوە دەربخەن ، کەکاری هەندێ کەس بووەو ، یاسا سزای داون و ، بەرنامەیەکی ئامادەکراوی تورک و سیاسەتێکی تۆرانی پەیڕەوکراو نەبووە ، لەلایەکی تریشەوە ، وەک خوویەکی پەیڕەوکراوی کۆنی تورک ، لە دێرزەمانەوە ، کەوتنە ڕێگاخۆش کردن ، بۆئەوەی ئەم تاوانە بەکورددا بلکێنن . ئەمەش دەقی ئەو قسەیە کە - صدراعظم - واتە ئەو - توفیق پاشا - یە کە نیو سەدە لە دەوڵەتدا ، لە وەزارەتدا بووەو ، دوای شەڕ راگیرانیش چووبۆ لەندەرە - لەندەن - و ، لە یەکەمین وتاریدا ، لە کۆنگرەدا خویندیەوە ، وتی :

" ئەوانەی کوشتاری ئەرمەن - یان کرد ، کوردبوون و تورک و حکومەتەکەشیان لەوە بێ بەرین و ، ئەگەر پێویستی جەنگ وسەرقاڵ بوون نەبوایە بەجەنگەوە ، حکومەت نەیئەهێشت ئەوە روو بدات و ، سزای ئەوانەیشی ئەدا کە راستەوخۆ کردوویانە " .

ئا بەم جۆرە سەرۆکی وەفدی رەسمی تورکی ، لە کۆنگرەداو ، وەزیری دەوڵەتی عوسمانی و ، نوێنەری خەلافەتی ئیسلامی ، ئەم تاوانە گرانە ئەخەنە ئۆباڵی کورد ! بەبێ ئەوەی تۆسقاڵێ هەست بە ئازاری ویژدانی بکات ، لە بەرانبەر ئەو درۆ هەڵبەستنەدا ، دژی نەتەوەیەکی گەورە ، کە چەندان جار بەپاکی خزمەتی حکومەتەکەیانی کردبوو ، بەو گیانەوە کە گوایە نوێنەری خەلافەتی ئیسلامە .

بەڵام بۆ بەختەوەری ، لە شوێنە گشتیەکاندا بڵاوبوەوە و ئەرمەنیش - خۆیان دانیان بەوەدانا ، کە گەلی کورد لە گەرمەی جەنگی گشتیدا چاکەیەکی گەورەی مرۆڤانەی لەگەڵ کردوون ، بەوەی لە کووشتارەکەی

ئەرمەن دا ، ژیانی پەنجا هەزار ئەرمەنی پاراست لە دەست دڕێژی تورک و لە ماڵی خۆیاندا ولە ناو خێزانەکانیان دا، شاردیاننەوە ، تا دایاننە دەست سوپاگەلی رووسی و، ئەوتیپە ئەرمەنیانەی لەکاتی جەنگی گشتیدا، دەستیان بەسەر ناوچەیەکی گەورەی کوردستاندا گرت، بەم جۆرە درۆی ئەو وەزیرە تورکیە پووچەڵ کرایەوە، کە دەیویست بیلکێنێ بە گەلی کورد دا .

مسیۆ ـ کلیمەنسۆ ـ ش[1]، هەرئەوکاتە بەناوی دەوڵەتانی ئەوروپاوە، ئەم قسە گرنگەی کردو وتی : " تورکەکان زۆر بەئاشکرا سەلماندیان ، کە بەهۆی بەڕێوەبردنی خراپیان و رزۆداری هەمەچەشنەیانەوە، لەچەندان سەردەم دا ، توانای ئەوەیان نیەو شایستەی ئەوەنین رەگەزی ناتورک بەڕێوە ببەن، بۆیە ئەگەرحاڵ وا بڕوات پێویستە نەیەڵین هیچ نەتەوەیەک لەژێر ئیدارەی تورکدا بێت " .

ئەو وتارە گرنگەو، چالاکی کۆمەڵەکوردییەکان لەم دەمەدا بابی عالی پەژارەکردو، ترسی لێ نیشت و، کەوتە بیرکردنەوە لە فێڵێکی تر ، بۆ رێگا گرتنی جیابوونەوەی کوردستان لە بابی عالی و، سەربەخۆبوون لە ئیدارەی تورک ، لەبەرئەوە حکومەتی تورک و، رۆژنامەکانی کەوتنە ئەوەی بەیادی کورد بهێننەوە کە ئەگەرئیسلامەتی ، نەهامەتی بەسەر هێنان ، ئەوا خۆیان بەسەرخۆیانی ئەهێنن و، دەربارەی برایەتی ئیسلام و هاونیشتمانی لەولاتی عوسمانیداو ، گەلێ وشەی تری بۆش کە دەمێک بوو موسڵمانانی عەرەب وکوردو ، هی تریشیان پێ تەفرەئەدا ، دەست بەجێش بابی عالی کەوتە پێکهێنانی لیژنەیەکی سەربەوەزارەت کە لە کێشەی کورد بکۆڵێتەوەو رێگای بەڕێوەبردنی کوردستان لە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی عوسمانیدا بگرێتەبەر ، بۆئەمە لیژنە لە :

شێخی ئیسلام حەیدەری زادە ئیبراهیم ئەفەندی و، عەبوق پاشا ـ ی سەرپەرشتیاری ـ ئەشغال ـ و عەونی پاشا ـ ی سەرپەرشتیاری زەریاو ، لە ئەندامانی کۆمەڵەی بەرزێتی کوردستان ، میرئەمین عالی بەدرخان و،

---

1- مسیۆ جۆرج کلیمەنسۆ ـ لەوکاتەدا سەرۆکی کۆنگرەی ـ ئاشتی ـ بوو لەپاریس ( م )

مراد بەدرخان و، ئەندامی ئەنجوومەنی ئەم سپیانسەییدعەبدولقادر ئەفەندی ـ ی . ئەم لیژنە سەربەوەزارەتە، لەبابی عالی کوبووەوە و، چەند دانیشتنێکیان کردو، تێکڕا لەسەر ئەمانە ڕێکەوتن :

١ـ سەربەخۆیی بدرێ بەکوردستان، بەمەرجێ کوردقایل بن هەر لە یەکێتی ی عوسمانیدا بمێنێتەوە .

٢ـ هەموو تەدارەکێکی پێویست بۆئەم سەربەخۆییە جێبەجێ بکرێ و بەگورجی دەست بکرێ بەئەنجامدانی . والێرەشدا وەک بەڵگەنامەیەکی مێژوویی، ئەوبانگ هێشتنەی بابی عالی، وەک خۆی بڵاو ئەکەینەوە، کەبۆیەکێک لەئەندامانی ناردووەو داوای لێ ئەکات بۆئامادەبوون لەو لیژنەی سەربە وەزارەتەدا، کەباسکرا :

بۆبەڕێز ـ ئەمین عالی بەدرخان پاشازادە

بەرێزوەندی پێویست بەئامادەبوونی بەڕێزتان ئەکات لە لیژنەی سەربەوەزارەت دا، کەرۆژی سێ شەممەی داهاتوو، کوئەبێتەوە، بۆیە تکائەکەین کاتژمێری دووی دوای نیوەڕۆی رۆژی ناوبراو، ئامادەبن .

لەبری صدر اعظم ـ
ئیبراهیم حەیدەری
نوێنەری وەزارەت بۆ سەرۆکایەتی
کردنی ئەنجومەنی تایبەتی

هەفتەبەدوای هەفتەداهات و، مانگ هات و مانگ چوو، کەچی ـ فەریدپاشای صدراعظم ـ هیچی لەبڕیارەکانی لیژنەی ناوبراوجێبەجێ نەکرد، بەڵکو هەرگفتی پێچەبەدەورەی ئەدا، لەبەرئەوە نیشتمان پەروەرانی کورد، ناچاربوون سەرلەنوێ لای دەزگا سیاسیەکانی ئەورپاو، وڵاتانی تردا، تەقەللایان تازەبکەنەوە . بۆئەمەش هەر یەکەلە ـ کۆمەڵەی بەرزێتی کورد ـ و ـ کۆمەڵەی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی ـ و ـ کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان ـ ژەنراڵ ـ شەریف پاشا ـ یان بەنوێنەر

هەڵبژارد ، تا کاری ئاکۆکی کردن لەسەربەخۆیی کوردستان و ، سەر خستنی کێشەی نیشتمانی کورد، لەبەردەم دەوڵەتانی هاوپەیماندا ، لە کۆنگرەی ئاشتی ، لە ئەستۆ بگرێ ... چالاکی و تەقەللای نەپساوی نیشتمان پەروەرانی کورد، بەهەموو رێبازە سیاسیەکانیەوە - چونکە ئاواتیان یەک بوو - بەسایەی سیاسەت و زرنگی شەریف پاشاوە[2]، ئەم ئەنجامانەی لێ هاتە بەرهەم :

١- پەیمانێک لەگەڵ خۆی و ، بۆغوس پاشا - ی سەرۆکی وەفدی ئەرمەنی لە پاریس هاتەگۆرێ ، کەتیایدا ئەوشتانەی لەنێوان کورد و ئەرمەندا ، ناتەبایی لەسەرهەبوو، بە ئاشتی و بەبێ دەست تێوەردانی دەوڵەتان ، چارەسەرکرا .

٢- ئەم بەندانەی خوارەوە ، کەتایبەتن بەکوردستانەوە ، خرانە پەیمانی بەناوبانگی - سیڤەر - ەوە ، ئەمەش ئەوبەشە تایبەتەیە بە کوردستان ، کەلەپەیمانی - سیڤەر - ی ( ١٠ ی تەمووزی سالی ١٩٢٥ ز ) دەرهێنراوە :

— — — — — — —

2- لەمەڕ چالاکی - شەریف پاشا - لەم بوارەدا ، لەکۆتایی کتێبەکەدا دەقی تەواوی ئەو یاداشتە بلاوئەکەینەوە ، کەناوبراو پێشکەشی کۆنگرەی - ئاشتی - کردووە لەپاریس ( م )

# پەیمانی - سیڤەر - ساڵی - ١٩٢٠ - ز

## بەشی سێیەم : کوردستان[1]

بەندی 62

" لیژنەیەک ، کەمەڵبەندەکەی لە - قسطنطینیە[2] - ئەبێ و لە سێ ئەندام پێک دێ و، هەر ئەندامەی یەکێک لە سێ دەوڵەتی: ئینگلتەرە و ، فەرەنسا و، ئیتالیا دایئەهێنن ، لەگەڵ مێژووی بەجێ هێنانی ئەم خودموختارییەدا ، بە شەش مانگ بۆ دەست نیشان کردنی ئەو ناوچانەی رەگەزی کوردیان تیایەو، کە وتوونەتە خۆرهەڵاتی - فورات - و، باشووری خۆرئاوای - ئەرمینیا - وە ، وەک لە دوایشدا دەست نیشان ئەکرێ. سنووریکیش بوجیاکردنەوەی تورکیا ، لەسووریا و، عیراق ، بەوپییە دیاری ئەکرێ ، کە لە دەقی دووەمین و سێیەمینی برگەی دووی ، بەندی 27 دا هاتووە . بەڵام لەکاتی رێک نەکەوتن لەسەرهەربابەتێک ، ئەوا ئەندامانی لیژنەکە : - کۆمیسیونەکە - دەنگ لە حکومەتەکەی خۆی ئەگیرێتەوە ، پێویستیشە ئەم پرۆژەیە زامنی تەواوی بۆ پاراستنی کلدان و ئاشووری و، کەمایەتی رەگەزو ئایینی تری ناوئەم ناوچانەی تیابێ ، لەبەرئەمە لیژنەیەک لە نوێنەرانی بەریتانیا و، فەرەنسا و ، ئیتالیا و -ئێران - و، کورد ، ئەگەڕێت بۆپشکنین و بڕیاردانی راست کردنەوەکە ، ئەگەر بینرا پێویستە دەربارەی سنووری تورکیا بکرێ . چونکە بەپێی بەندەکانی ئەم پەیمانە ، سنووری باسکراو، لەگەڵ ئێران - یشدا

---

١- لەکاتی وەرگێڕانی ئەم ( 3 ) بەندەی ناو پەیمانی سیڤەر - دا کە پەیوەندییان بەمافی سەربەخۆیی کوردستانەوە هەیە ، بەرگی یەکەمی یاداشت - ەکانی ئەدیبی گەورە - رەفیق حیلمی - م بەسەر کردەوە ، لەدوای بەراوردکردنیان لەگەڵ دەقی وەرگێڕانەکەی لای مندا ، بۆم دەرکەوت - لەگەڵ ئەوەشدا کە هەردووکیان لە فەرەنساییەوە وەریان گرتووە - وردە جیاوازییەک بەرچاو دەکەوێ خۆیە بە پێویستم زانی ئاماژە بۆئەمە بکەم و ، هەرکەسیش ئەیەوێ بەراوردیان بکات . با بڕوانێتە لاپەڕەکانی (19 - تا 22 ) ی بەرگی یەکەمی یاداشتەکانی - رەفیق حیلمی - بەغدا چاپخانەی [illegible]ریف 1956 ز -(م)

٢- مەبەست لە ئەستە[illegible] (م).

بەندی 63

" حکومەتی عوسمانی ، لەمڕۆوە پەیمان ئەدات لەماوەی (3) مانگدا لەومێژووەوە کەتیایدا ئاگادارئەکرێ ، بڕیارەکانی هەردوو لیژنەی کۆمیسیون ، کەلەبەندی (67) دا باسکراون ، لەئەستۆ بگرێ و جێ بەجێیان بکات " .

بەندی 64

ئەگەرلەماوەی سالیکدا ، لەمێژووی دەستپێکران وجی بەجی کردنی ئەم پەیمانەوە ، گەلی گەلی کوردی نیشتەجیی ناو ئەو ناوچە دەستنیشان کراوانە ، کەلەبەندی (62) دا هاتوون ، داوایەکی پێشکەش بە کۆمەڵی نەتەوەکان کرد ، کەبڵێ زۆربەی خەڵکی ناو ئەم ناوچانە،ئارەزوو ئەکەن لەتورکیا جیا ببنەوەو ، کۆمەڵەی ناوبراویش لەوباوەڕەدابێ ، کە ئەم گەلە ئەتوانێ سەربەخۆبێ و ، پێ سپێری ئەمە بکات ،ئەوا تورکیا ش لەئێستاوە پەیمان ئەدات ئەو پێ سپێریە جێ بەجێ بکات و ، دەست بەرداری هەموو ماف وئیمتیازێکی خۆی ئەبێ لەوناوچانەدا . ئەم دەست بەرداربوونەش بەدرێژی ، بابەتێکی تایبەتی ئەبێ لەنێوان زۆربەی وڵاتانی هاوپەیمان و تورکیادا ، بۆیەلەکاتی دەست بەرداربووندا ، کە بوو ، هیچ بەرهەڵستیەک لەلایەن وڵاتانی هاوپەیمانی ناوهێنراوەوە ، ناخرێتە بەرانبەر مەیلی کوردی نیشتەجێی ئەوبەشەی خاکی کوردستان، کەتائەمڕۆ ، لەویلایەتی ـ مووسل ـ دان و، بەخواستی خۆیان ئەیانەوێ لەگەڵ حکومەتە سەربەخۆکەی کورددا ، یەک بگرن " .

مستەفا کەمال [3] پاشا ـ ش ، کەلەناوچەی ئەنادۆڵدا بزووتنەوەیەکی بەرپاکردبوو، کاتێ زانی بابی عالی، بەپەیمانی ـ سیڤەر ـ قایل بووە

3- مستەفا کەمال : لەسالی 1881ز ـ دا لە ـ سلانیک ـ لەدایک بووە ، باوکی جولەکەبەو ، دایکی یونانییە . چۆتە سوپاوە و پلەکانی سەربازی بڕیوەو ، بووە بەسەرۆکی پارتی نیشتمانی تورکی ولەسالی 1923ز ـ دا کرا بەسەرکۆماری تورکیا . بەگشتی دوژمنێکی سەرسەختی کوردبوەرەب وموسلمانەکان بوو ، پیتەکانی عەرەبی لابردو نووسینی کرد بەپیتی لاتین . لەڕۆژی ( 1938/9/10ز ) دا مردووە . بڕوانە گوڤاری ـ التربیە الاسلامیە ـ کەلەشاری بەغدا دەرئەچێ ـ ژمارە ـ 8 ـ سالی 1976ز ـ ( م )

و ، پەیمانەکەش دان ئەنێ - هەرچەندە دانپیانانێکی ناتەواویشە - بەمافی ژیانی کوردو، سەربەخۆیی کوردستاندا ، بۆی دەرکەوت ناتوانی لەلایەکەوە بەربەرەکانی کوردو، لەلایەکی تریشەوە بەربەرەکانی-بابی عالی - بکات ، بۆیە دوای کۆنگرەی ئەرزەرووم[4] بەهۆی زۆرزانی و فرت وفێڵی خۆیەوە ، کەوتەکنەکردن لەسەرکردە کوردەکان و ئەندامانی کۆنگرەی ناوبراو و ، ئەوەی بۆ روون کردنەوە کەچاکتروایە کێشەی کورد دوابخرێ ، تاهەموو وڵاتی تورک لەدوژمن پاک ئەکرێتەوەو،ئاشتی گشتی ئەبەسترێ ، چونکە پاک کردنەوەی وڵات ، بەیەکێتی‌ی هەردوو رەگەزی کوردو تورک نەبێ ، کەخاوەنی وڵاتەکەن ،سەرناگرێ . گفتی ئەوەشی پێ دان کەتورکیا بەئاشکرا ، دان بەکورد و سەربەخۆیی کوردستاندا ئەنێ و، رووبەرێکی لەوەگەورەترو بەرینتریش ئەدات بە کورد ، کەلەپەیمانی - سیڤەر - داهاتووە .

دیارە لەم کاتەشدا رۆژنامەکان ، لەناوخۆو دەرەوەی وڵاتدا ، شتی زۆریان لەسەر ئەونەهامەتیە ئەنووسی ، کەبەسەرئیسلام وموسڵمانانـدا دێت ، ئەگەر کوردوتورک یەک نەگرن ، لەبەرامبەر ئەو دوژمنانەدا کەچاویان بڕیوەتە تورکیا . هەموو رۆژنامەکانیش ئەوقەوانە کۆنەیان لێ ئەدایەوە " کەسۆزی ئایین پەروەری لەناوکورددا و، پابەندی

---

4- کۆنگرەی ئەرزەرووم : کۆنگرەی سیواس - یشی پێ ئەڵێن ، لەپاش تێشکانی لەشکری عوسمانی‌و داگیرکردنی ئەستەموڵ لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە ، خەلیفەی عوسمانی وحکوومەتەکەی بوون بە دەسکەلای هێزەداگیرکەرەکان . ئالەم کاتەدا - مستەفاکەمال - ی ئەفسەر کرابەپشکەری سوپای گشتی عوسمانی لەئەنادۆڵ . ئەم وەزیفەتازەیە دەرفەتێکی لەباری بۆئەم ئەفسەرەتورکە رەخساند ، کەپەیوەندی بەسوپاوفەرماندەکانیەوەبکات . لەرۆژی ( 1919/5/15 ز ) دا گەیشتەئەنادۆڵ وچاوی بەئەفسەرە پایەبەرزەکان کەوت و، دەروونی خۆی بۆیەکالاکردنەوە ، کەئەیەوێ جووڵانەوەیەکی شۆڕشگێری بەرپابکات و، وڵاتەلەگرتێژنە دەرچووەکەی بخاتەوەسەرباری راستەو شکۆو ،ساملی وڵات و کەرامەتی پێ شێل کراوی بهێنێتەوە دۆخی جارانی . ئەفسەرەکانیش زۆربەگەرمی‌پێشوازیان لەوبیر و باوەڕەکرد، ئیتر بۆهەمان مەبەست چووە - ئەرزەرووم - و لەوێش لەگەڵ پایەبەرزانی فەرماندەی تورک دا گەیشتە بەرنامەیەکی دیاریکراو ، بۆخۆیان ، کەحکومەتی دەسکەلای هاوپەیمانەکان ، بەم کارەی ئەمیان زانی ، گوێزایانەوە بۆئەستەموڵ . ئەمیش سەرپێچی لەوفرمانەکردو ، ئەڕۆیشت و،لە ئەرزەرووم وسیواس دا دووجار کۆنگرەی بەست . گەلێ لەئەندامانی ئەنجوومەنی - ئەمەووسانی - عوسمانی کەلەئەستەموڵ دائەنیشتن ، بەشداریان لەم دووکۆنگرەیەداکردووە .بڕوانە یادداشتەکانی - رەفیق حیلمێ - بەرگی یەکەم - بەغدا - چاپخانەی مەعاریف - 1956 ز - ( م )

کوردو تورک و ، ئەوکتێوە بەرزانەی کورد، کەنیشانەی سەربلندی و جوامێری کوردن ، ئەمانە هەموو، والەکوردئەکەن ، کەدەستبەرداری تورک نەبن و ، بەتەنیا لەبەرەکانی جەنگیندا بەجێی نەهێلن ، مستەفاکەمال بەم قسەبریقەدارانە ، کاری لەدەروونی زوربەی کورد کرد ، بەڵام کەمێک لەکوردی هوشیار هەبوون ، کەدەمێک بوو بەتەواوی تورکیان ئەناسی و هەرگیز تارمایی ئەوتاوانانەی تورکیان لەمێشکدا نەئەڕەویەوە ، بەتایبەتی ئەوتەڵەکەبازییە تورکییەی کەلەلیژنەکەی وەزارەت دا ، ویستیان لەگەڵ کۆمەڵەو رێکخراوەکوردییەکاندا بیکەن، لەبەرئەوە چاوورِاوەکانی مستەفاکەمال لەخشتەی نەبردن و مەرجیان دانا بۆیان ، کەئەگەر راست ئەکەن لەپەیمانەکەیاندا ، باپێشەکی وبۆ دلنیابوون لەنیازپاکییان ، دەست بەجێ ، هێزەسەربازییەکانی تورک و چەکدارە مولکییەکانیان ، لەکوردستان بکشێنەوە ، بەڵام داخەکەم زوربەی کورد بەوپەیمانە درۆیانە تەفرەیان خواردو ، سۆزی ئاییین پەروەری و مرۆڤانەیان رایان کێشان ، بەم جۆرەگەلی کوردی کلۆڵ ، جارێکی تریش کەوتەوە ژێرچنگی ئەوتۆرانیانەی بەزەییان پیایاندا نەئەهاتەوە .

ئەونیشتمان پەروەرە کوردانەش ، کەهەرگیز بڕوایان بەقسەکانی مستەفاکەمال و پەیمانەکانی تورک ، نەئەکرد ، بیریان لەوە کردەوە بەچەک بەرگری لەومافەی کوردستان بکەنەوە ، کەدوای تەقەللا و ماندوو بوونێکی زۆر گەورە ، پەیمانی ـ سیڤەر ـ ی باسکراو ، دانی پیا ناون، بەڵام کاتێکیان زانی دەوڵەتانی هاوپەیمان لەبەردەمیاندا قوت بوونەتەوە ، کەپێیان وابوو نابنەکۆسپێک لەرێگای هێنانەدی ئاواتە نیشتمانیەکانیاندا .

بەشێکی گەورەش لەباشووری کوردستان ، ئینگلیز داگیری کردبوو ، فەرەنساییەکانیش سەر رۆخەکانیان گرتبوو، بەڵام باکووری کوردستان رووس و ئێران و تورک داگیریان کردبوو.

سەرانی وەفدی دەوڵەتانی هاوپەیمانیش لەپاریس ، ئەوەیان بۆ ـ شەریف پاشا ـ ی سەرۆکی وەفدی کوردبۆکۆنگرەی ئاشتی ئەسەلماند،

که پێویسته له‌م کاته‌دا کورد ئارام وهێوربێ ، تــا بــه ئــاواتــه نه‌ته‌وایه‌تیه‌کانی خۆی بگات ، چونکه هه‌رته‌قه‌للاو بزووتنه‌وه‌یه‌ک ، که زیان به هێمنی بگه‌یه‌نێ ، داخوازیه نیشتمانیه‌کانی کورد ، تووشـــی زیان ئه‌کات . سه‌رانی ده‌وڵه‌تانی هاوپه‌یمان ونوێنه‌ره‌کانیشیان ، لــه ئه‌ستانه - هه‌رئه‌م قه‌وانه‌یان بۆ نوێنه‌رانی کۆمه‌ڵه‌کوردیيــه‌کــانلێ ئه‌دایه‌وه .

ژه‌نراڵ - ماک ئه‌ندۆ - ی فه‌رمانده‌ی هێزه‌کانی ئینگلیزیش لــــه‌و کاته‌دا له‌کوردستان ، بڵاوکراوه‌یه‌کی به‌زمانی کوردی پــ خش کــرده‌وه ، ئه‌مانه‌ی تیابوو :

" له‌به‌رئه‌وه‌ی چاره‌نووسی خاکی عوسمانی ،که‌زوربه‌ی‌دا نیشـــتوانی له‌ره‌گه‌زی کوردن و ، له‌کۆنگره‌ی ئاشتی‌دا بریاری له‌سه‌رئه‌درێ ، کــه دیاره ئاواته نه‌ته‌وه‌ییه‌کانی کوردو ، مافه‌کانی ســـروشـــتی‌ی کــورد و کوردستان ئه‌هێنێته‌دی ، بۆیه له‌سه‌رکورد پێویسته‌ئارام و هـێوربن و ، دڵنیاش بن له‌دا ده‌په‌روه‌ری ئینگلته‌ره ، که‌مافه‌کانی کورد ، ئه‌پارێزێ " .

که‌چی له‌لایه‌کی تره‌وه ، میرئالا - بیل - ی ســه‌رۆکی ئیســـتیخباراتی ئینگلیزی له‌حه‌له‌ب ، نه‌یهێشتبوو - میرثوره‌یا به‌درخان - ی سکرتێری کۆمه‌ڵه‌ی - سه‌ربه‌خۆیی کوردستان ، له‌حه‌له‌ب - به‌یاننامه‌یه‌کی‌کوردی بڵاوبکاته‌وه ، که‌فرت وفێڵی مسته‌فاکه‌مال - ی تیا ئاشکراکردبوو ، پێشـی وتبوو گه‌وره‌ترین خزمه‌ت وچاکترین که‌ڵک به‌خشین ،که‌ئێستا پێشکه‌شـی گه‌لی کورد بکرێ ، ئه‌وه‌یه داوای دان به‌خۆداگرتن و ،ئارامییـــان لــێ بکرێ ... دیسان هه‌رئه‌م میرئالا ئینگلیزه ، کاتێ هه‌ستی کردبوو ، میر جه‌لاده‌ت به‌درخان و ، میرکامه‌ران به‌درخان و ، ئه‌کره‌م به‌گی جه‌مـیل پاشازاده‌ی نوێنه‌رانی کۆمه‌ڵه‌ی به‌رزێتی کوردان ، له‌چیای - کاختــه - خه‌ریکی کۆکردنه‌وه‌ی هێزه‌کانی کوردن بۆبه‌ره‌چدانه‌وه‌ی هێرشـــێکـی مسته‌فاکه‌مال - ی تورک ، که‌ئه‌یه‌وێ له‌ناکاوێکدا و ، به‌بێ هــۆیـه‌کـی زانراو په‌لاماری نیشتمان په‌روه‌رانی کوردبدات ، چووبووه - مه‌لاتیـه - ، بیگباشی - نوئێل - ی[5] ناردبووه‌لای نوێنه‌رانی باسکراوی کورد ،

---

5- بیگباشی - نۆئیل : - مه‌به‌ست له‌و مێجه‌ر نۆئیل - ه‌یه که‌له‌سالی 1919ز به‌دواوه ، هــاتۆته

تا بەناوی حکومەتەکەیەوە ئاگاداریان بکات ، کەپێویستە دەست بەجێ هێزەکانی کورد، بڵاوەی لێ بکەن ، ئەگینا بچووکترین تەقەللای چەکدارانە ، کێشەی کورد ، کە ئێستا وڵاتانی ئەورووپایی لێی رازین ، ئەخاتە مەترسیەکی گەورەوە . کەچی نیشتمانپەروەرانی کورد ، کە بەچاکیش تورکیان ئەناسی و، لەوانە نەبوون ، بەم قسەو پەیمانانە هەڵخەڵەتێن ، زۆربەداخەوە ، بەقسەوپەیمانی ئەوپیاوانەی ئەورووپا هەڵخەڵەتان ، کەبەهۆی وتاری سیاسی و، قسەی رەسمیانەوە نەبێ ، نەیان ئەناسین و، دەرفەتی پەیوەندی پتەوەکردنیان بونەڕەخسا وە ، تا لەبواری سیاسی وتاوەدانی و . کاروباری جیهانی وشتی تردا بیانناسن و ، بەچاکی لەوانە بگەن ، کەتیایدا بەشداری ئەکەن .

لەبەرئەوەش کەوڵاتانی هاوپەیمان ، بەئاشکرا گفتی ئەوەیان لەئەستۆگرتبوو، کەئاواتە نیشتمانیەکانی کورد،ئەهێننەدی و،مەرجیشیان بۆئەمە ،ئەوەبوو ، تاکارەکانی کۆنگرەی ـ ئاشتی ـ کۆتاییان دێت،ئەبێ گەلی کورد ، ئارام وهێمن بێ ، بەڕاشکاویش ئەوەیان ئەوت ،کەئەگەر تورک پەیمانی سیڤەربەئەنجام نەگەیەنێ ، لەـ ئەستانەـ ش بۆیەری ئەکرێن ، بۆیە لەم داروبارەدا کورد ، لەوەزیاتر کەمتمانە بەم قسەو پەیمانانەبکات و دان بەخۆیدا بگرێ و هێمن بێ ، شتێکی تری پێ نەئەکرا . . . بەم جۆرەش هەولی زۆرو کاتی زۆرلەبارو گرنگیان لەدەست دا ، بۆبەدیهێنانی نیازە نیشتمانییەکان و ، جارێکی تریش

کوردستان و، لەسەرەتادا چوتەناو خێڵی ـ بەختیاری ـ و ، پاشان لەسەردەمی حوکمداری ـ شێخ مەحمودی نەمر ـ دا هاتۆتە سلێمانی ودواییش چوتەکوردستانی تورکیا ، ئەگەرچی نۆئێل ماوەیەکی کەم لەناو کورددا ژیاوە ، بەڵام لەوماوەکورتەدا توانیوێتی بەباشی زمانی کوردی فێربێ و هەست و سۆزی گەلی لەپیاوەناودارەکانی کوردیشی بەلای خۆیدا راکێشاوە ، بەڕاستی یەک یەکێک لەکەلە روناکبیرەکانی ئەوسەردەمەی وەک ( ماموستا رەفیق حیلمی ) گەیشتۆتەئەوقەناعەتەی کەئەگەر ئیش وکار لەوکاتەدا بەدڵی ( میجەرنۆئێل ) بووایە ، گەلی کورد بەگەلێک لەئامانجەکانی خۆی شاد ئەبوو. نۆئێل لەوماوەیەدا کەلەکوردستان بووە ، یاداشتێکی بەولە مەندی لەدووبەرگدا ، سەبارەت بەدیدەنی وگەشت وبیروڕاکانی خۆی لەمەڕ کوردوکوردستان نووسیوەتەوە ، بەرگی دووەمیان کەتایبەتە بەکوردستانی تورکیا ، لەم دواییەدا کرا بەکوردی . بۆزیاتر تێگەیشتن لەنۆئێل بڕوانە بەرگی دووەمی یادداشتەکانی مێجەرنۆئێل لەکوردستان ـ وەرگێڕانی ـ حسین ئەحمەد جاف ـ و ـ حسین نیرگزەجاڕی ـ و ـ یادداشتەکانی ماموستا ـ رەفیق حیلمی ـ ( م ) .

بڕوا بەو وشەیەکرایەوە ، کەئەڵێ : " مێژووخوی‌دووبارەئەکاتەوە "چونکە ئەوملململانێیەی وڵاتانی ئەوروپاو،سیاسەتی هاوتابوونی دەوڵەتان ، کە دەوری گەورەیان لەهێشتنەوەی دەوڵەتی عوسمانیدا هەبوو، هەردوای شەڕ راگیران بەئاشکرا ، دوورکەوتنەوەو، وایان کرد ئەودەوڵەتانەی کە لەکاتی جەنگدا هاوپەیمان بوون ، لەئاشتی‌دا ، ناتەبابن ، چونکە ئەو تەماعەی بەهۆی جەنگەوە لایان دروست بوو، لەئاشتی‌دا نەهاتەدی . بۆیە هەمدیسانەوە ئەم دوو هۆیە بوونەمایەی رزگارکردنەوەی تورکیا لە تیاچوون ونغرۆبوون . بەم جۆرە هەموپەیمان و تایبەتەکان‌لەمەڕمافی هەموو نەتەوەیەکی زۆرلێکراو لەبڕیاردانی چارەنوسیدا و ،ئەوبڕیارانەی دەربارەی نەهێشتنەوەی هیچ نەتەوەیەکی ناتورکدا ، لەناوقەڵەمڕەوی تورکدا ، هەموو ئەمانە لەنرخی نەبووان بوون و، مەرەکەب بوون لەسەر کاغەز.

وادیارە ئەورەخنەوشی کردنەوانەی مسیۆ-بورجوا- ی ماموستای مێژووی سیاسی و، زانستی سیاسەت ، لەزانکۆی - پاریس -کەلەبەرگی دووەمی کتێبەکەیدا ، دەربارەی مێژووی سیاسەتی ئەم سەدسالەی دوایی نووسیویێتی ، کت ومت لەگەڵ رووداوی ئەم ساڵانەی‌دواییدا ، یەکن ، کەئەڵێ :

"دەوڵەتان دەستیان کردووەبەوەی خۆیان بەیارمەتدەری مافی نیشتمانی و نەتەوایەتی بزانن ، کەپێشتر بەهەموو هێزیانەوە بەربەرەکانییان ئەکرد، چونکە هەستیان کردبوو کەئەنجامەکەی ترسناکە، بەڵام هەرکەمەترسییان لەسەرنەما ،حیزبەکانیان کرد بەدۆستی خویان، هەندێکیان کەوتنەدوستایەتی و گۆڕینەوەی بەرژەوەندی بەرامبەر ، لەراستیدا بەلای منەوەئەم رێکەوتنەیان ، هەرلەرێکەوتنی ئەو کومپانیانە ئەچێ ، کەلەسەرهەندێ پارەی پیس رێک ئەکەون، وەک رێکەوتنەکەی - فریدریک - ی دووەم ، دژی پۆڵۆنیا ، کە لە هەموو دەقیقەیەکدا لەبەردەم هەڵوەشاندنەوەو دۆڕاندنا بوو، بەهۆی ئەو ناکۆکییەی کەلەسەر قازانج بەشکردن و، چاوبرسێتی زۆرو ، پاشگەز بوونەوەی جیاجیادا دروست ئەبوو، زۆریشیان بەشان وباڵی ئەم

رێکەوتنە پیرۆزە دا هەڵدا ، کە مشت ومڕو ڕەخنە یەکی زۆر هەڵئەگرێو ،ئەو هۆیا نە ش کە بوونە ما یە ی بە ستنی ، بێ بە ری نین لە گوما ن و ورتە ورت "!

دیا رە ئە وپە یما نە ش کە لە نێوا ن تورکیا و، وڵاتا نی وە ک ئـــــا وا ی ئە ورووپا دا ببە سترێ ، دوا ی ڕە وینە وە ی ترسە کا ن دووبــــا رە نـیــــا زە ئیمپریا لیستیە کا نی سە رهە ڵئە دا تە وە و، ئە وکا تە ش ، دوا ی ئـــەوە ی نە تە وە ی کورد، ئە ودە رفە تە بە نرخا نە ی لە دە ست دا ، ئە ڵێین شـتێکی سروشتییە ، کە کوردو کوردستا ن ، جێگا یا ن لە نا وبە ندە کا نـــی ئـــــەو رێکەوتنە دا نا مێنێ ... هە ربە را ستیش وا کە وتە وە ، چـونکـە پە یمـا نی - لۆزا ن - کە لە دوا ی پە یما نی - سیڤە ر - بە سترا و، شتێکی وا ی بو کورد تیا نە بوو، لە خە ڵە تا ندنی کورد زیا تر، بە چە ند بە ندێکی پووچ و،جـا رێکی تر بە هۆی ئە وپە یما نە وە دە وری خوێنا وی کورد، دە ستی پێ کردە وە،بەڵام مستە فا کە ما ل پا شا هیچ نیا زێکی خۆی بە را نبە رکورد دە رنە بڕی ، تـا ئـەم پە یما نە بە سترا ، تە نا نە ت خۆی و ئە ندا ما نی ئە نجوومە نی نیشـتما نـــی لە - ئە نقە رە - قسە کا نی - حسین بە گ - ی نوێنە ری ئە رزە رووم - یـا ن لە ئە نجوومە ندا ، بە چە پڵە و ها وا رو خۆزگە پێشوا زی لێ کرد ، کـە وتـی : " ما فی قسە کردن لە سە رئە م بڵندگۆیە وە ، هە ربە تە نیا بۆهە ردوونە تە وەی کوردوتورکە " .

فە تحی بە گی سە رۆکی وە فدی تورکیش لە کۆنگرە ی - تە رسـا نە - کە بۆ چا رە سە رکردنی کێشە ی - مووسڵ - لە - ئە ستا نە - بە سترا ، هــــە ر لــەو کۆنگرە یە دا وتی : " ئە م نیشتما نە هە ربە تە نیا تا یبــە تـــە بە هەردوو نە تە وە ی کوردو تورک " ، کە چی کە پە یما نی - لۆزا ن - لە لایە ن هە مـوو دە وڵە تا نی ئە ورپا وە مۆرکرا ، ئیترشتێک لە بە ردە م مستە فا کــە مـــا ل دا نە ما یە وە ، ڕێی ئە وە ی لێ بگرێ نیا زە خوێنا وییە کا نی ، بـە را نبـە ر بــە گە لی کورد ، دە ربـبڕێ .

— — — — —

# شۆرشی گەورەی نیشتمانیی ساڵی ١٩٢٥ز

پەیمانی ـ لۆزان ـ مۆرکرا و، لە تورکیا دا لە کوردزیاتر رەگەزێکی گەورەتری تیا نەبوو ئەگەرچیش بڕیارێک لای تورانیەکانەوە هەبوو دژی کورد، بەڵام ئاخۆ ئەتوانرا ئەم بڕیارەجێ بەجێ بکرێ، یان پێویستی بەدەستکاری کردنێک هەبوو ؟ ! ئەمەیان کاری ئەوکەمال ـ یانە بوو، کە تێپێکی تربوون لەو ـ ئیتیحادی ـ یانەی ئەیان وت : با کورد تەفر و تونا بکرێ، چونکە شێواندن وتواندنەوەی کورد، لە ناو تورکدا بەرنامەیەک بوو هەرگیز جێ بەجێ نەئەکرا، لەبەر ئەوەی گەلی کورد بەشی خۆی هوشیاربۆوە و، گیانی نیشتمان پەروەریشی هەرتیا ئەژیا .

ئەنقەرە ـ ی فرت وفێڵاویش کە لەناو توندو تیژیدا لەدایک بووە و ـ مەودبەتی ـ[1] یە دڵ پیسەکان گۆشیان کردووە، ئەم باسەی هێنایە ناو ناوان و، بەپەلە بڕیاری پاکۆنانی گەلی کوردی بیانە بە تورک ـ ی لە رەگەز و، لە زمان دا، چونکە تواندنەوە کاتی بەسەرچوو، لەبەر ئەوە ئەبوایە پەلە لەمی تریاندا بکرێ، تا ئەوەی ماوە لە خەڵکی کوردستان بەشێوەکانی درندایەتی وتەڕنکاری، بکرێتە تورک . بۆ ئەمەش ئەبوایە بگەنە ـ تەوریز ـ ی تورک نشین، کە ناوچەیەکی گەورەیە لە ئێران، تا بیکەنە بنکە بۆجێ بەجێ کردنی بەرنامە تورانیەکەیان، لەسەرحسابی گەلانی ئێران . دیارە نیازو مەبەستیان بەرانبەر نەتەوەی فارس ـ یش لەوە چاکتر نەبووە، کە بەرانبەر نەتەوەی کورد هەیان بوو .

تورکیاش زۆرچاک ئەیزانی، ئەگەر دەست بەم نەشتەرکارییەی خۆی، کورد زۆربەتوندی بەرەنگاری ئەبێتەوە، بۆیە بە پێویستی زانی

1- مەودبەتی ـ یەکان ئەوجولەکانەن کە لەسەردەمی جیا جیا دا لەبەرچەوساندنەوەیان لە لایەن ئەوروپاوە، روویان کردۆتە تورکیا و خۆیان بە ئیسلام نیشان داوە و، پلە وپایەی دەوڵەتیان بەچنگ هێناوە و، حیزبی ئاینیان بەناوی جیا وازجیاوازەوە دروست کردووە، کە بەرووخسار بۆ بوژاندنەوەی تورک و بەناوەڕۆکیش بۆ هەڵتەکاندنی ئیسلام بووە .

هه موو ئه و ئه نجا مانه له نا وبه رێ كه ره نگه ولاّتا ن دا لّه ی كورد بـده ن ، یا ن نه یه لّن توركیا ئه وكوشتا ره له كوردستا ندا بكا ت بۆئه مه ئـه وه ی مسۆگه ركرد كه - فه ره نسا - له سوریا دا [2] بۆ لایه ن بوه ستێ بـه را نـبـه ر كێشه ی كوردو ، په یما نێكی دوستا یه تی و، درا وسێیێشی له گه لّدا به ست .

به لاّم ئینگلته ره ، وه ك پێشتریش ئا ما ژه ما ن بۆكرد ، كـه - لـۆرد كرۆزون - ی وه زیری ده ره وه یا ن و، سه رۆكی نوێنه ره كا نیا ن له كۆنگـره ی - لۆزا ن - چه ندا ن جا ر ئه وه ی دووپا ت كرده وه كه گوا یه پا رێزگا ری لـه ما فی كورد ئه كه ن ، كه چی هه ر دوا ی چا ره سه ركردنی كێشه ی - مووسل - كه له نێوا ن ئینگلته ره و توركیا دا بووه ، گفته كا نی وه زیری ده ره وه یا نـی له یا دكردو، په یما نێكی دوستا یه تی له گه لّ خۆی و توركدا مۆركرد . بـه م جۆره ئه ولایه نه شیا ن زا من كرد ، كه رێگرنه بێ لـــه بـه رنـا مـه دۆزه خ ئا سا ییه كا نیا ن له كوردستا ندا .

ئیتر دوا ی كۆتا یی پێ هێنا نی كێشه ی - مووسل - بـه و جـۆره ی كـه ئینگلته ره دا وا ی ئه كرد ، شتێكی وا له به رده م توركدا نه ما ، كه دوودلّ بێ له به رنا مه ی پا كۆدا نی كورد دا . له به رئه مه - ئه ركا نی ئه نقه ره ،ده ستی كرد به جێ به جێ كردنی ئه وبڕیا ره ی پێشتر ده ریا ن كردبوو، لـه هـه مـوو لایه كه وه ، به هه موو ئا مرا زێكی وێرا نكا ری و له نا وبردن ، هه رلـه توپ و تفه نگ وشمشێره وه ، تا ته ورو هه موو ئا مرا زێكی تری كوشتنده .

به مه ش وا زیا ن نه هێنا ، به لّكو زما نی كوردی - یـا ن لـــه هـه موو دا مه زرا وه و په یما نگا كا نی نیشتما ن دا نه هێشت وقسه كردنیشیا ن بـه كوردی ، له سه رجا ده و له دا نیشتن و، كۆڕو كۆمه لّ و نـا و دا دا گـا و ، به ڕێوه به را یه تیه كا نی ده ولّه ت دا قه ده غه كرد .سه رتلّپا ی گه وره پیا وا نی كوردو ، خا وه ن قسه و سه رۆك خێلّ وبه گ و شێخ و،سه را نی نیشـتما ن په روه ره هوشیا ره كا نیا ن ، بۆنا وچه دووره تورك نشینه كا ن دوورخسته وه، به م جۆره رێیا ن بۆخۆیا ن خۆش كرد، كه به رفه تی كوشتا ركا ری لـه ڕێ و با نی شا خا وی وسه خت ولێڕی وا چڕدا ، كه كه س رێی تێ نا كه وێ و جێگا ی

---

2- ئه وكا ته فه ره نسا له سوریا دا بووه )

وا ، کەکەس نا یبینێ .
بەڵام کورد- یش کە بەتەواوی تورک - یان ئەناسی ،نەک هەرتەنیا بەوەی هەرپەیمان وبەڵێن شکێنە ، بەڵکو بەوەی ئەیانناسین کەبە هیوان زۆر بەرق وبێ شەرمانە ، گەلی کوردیا کۆبدەن وبیبهارن . لە بەرئەوە بڕوایەکی ئەوتۆیان هەبوو، کەئەوەکانی تەتەرو مەغۆل ، هەربەتەنیا بە - زۆر - تێ ئەگەن ماف چییە ، بۆیە بۆپاراستنی ژیانی خۆیان شتێکیان شک نەبرد، لەوەزیاتر ، کەپەنابەرنە بەر- هێز -،کە تاکە رێگایەکە بۆبەرپەچدانەوەی ئەم کارەی تورک بەرانبەر بە کورد و نیشتمانەکەیان .
بۆئەمەش شەهیدی کوچ کردوو، میرئالا - خالدبەگی جەبرانلی - کە لەم دواییەدا بەدەستی تورک شەهیدکرا - لەسالی ۱۹۲۵ز- ئامرەنگی شۆرشی رشت و، هاورێکانی خۆی کرد بەنوێنەرو ، ناردنی بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان ، تالق و رێکخراوی گشتی دروست بکەن و، چەک وپێویستی جەنگ بەسەر شوێنەگرنگەکاندا دابەش بکەن . بڕیاریش درابوو کەلەبەرەبەیانی ( ۲۱ی مارتی سالی ۱۹۲۵ز- دا ) ، شۆرش دەست پێ بکەن ، کەچی وارێکەوت رۆژی ( ۷ی مارتی باسکراو) هێزێکی تورکی ، چووبووە گوندەکەی شەهیدی کۆچ کردوو - شێخ سەعید - کە ئەویش لەناو پەیمانەپیرۆزەکەدا بوو، بۆشۆرشە گشتیەکە ، ئیتر لەسەر شتێکی بێ بایەخ شەر لەنێوان مریدو دەروێشەکانی شێخ و، ئەوهێزەدا رووئەداو، ئاگری شۆرش پێش کاتی دیاری کراو بە ۱۵ رۆژ لە هەموو لایەکەوە ئەتەنێتەوەو، دەنگی گوللە ، کەلەگوندی - پیران - ی شەهید - شێخ سەعید - ەوە ، بەرزبووەوە ، هەموو کوردستانی گرتەوە .خالدبەگ وئەوئەفسەرە کوردانەش ، کەلەدەرەوەی سنووری شوێن کلێپەی شۆرشکەوە بوون ، روویان کردە شوێنی شەرەکە بۆسەرپەرشتی شۆرش وبەرێوەبردنی ئەبەرنەکە ، بەپێی ئەوبەرنامەیەی پێشتر بۆیان دانابوو،بەڵام زوربەیان پێش ئەوەی بگەنە شوێنی شەرەکە گیران و،دەستبەجێ بەبێ لێپرسینەوە و ، دادگا ، لەسێدارە دران .

ئەم شۆڕشە سەرەڕای ئەوەش ، پێش کاتی دیاری کراوی خۆی تەقیەوە ، هەڵگیرسێنەرانی و ، سەرکردەکانی و شارەزایانی لە هونەری جەنگیدا ، نەیان توانی تیا بەشدار بن و ، سەرەڕای ئەوەش کە جڵەوەکەی بەدەست ئەوانە بوو کە شتێکیان لە هونەری شەڕو نهێنیەکانی شۆڕش نەئەزانی ، بەڵام لە ماوەیەکی زۆرکەمدا بەفراوانی تەنیەوە ، بەجۆرێ تەشەنەی کرد ، زوربەی ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی تورکیاشی گرتەوە ، پێشمەرگەکانی کورد ، لەم شۆڕشەدا ، هەڵی باشیان لە دەست داو ، خوێنی پاکیان زۆر رژا ، بتوانن دەست بەسەرا گرتنی شارە گەورە و قایەکان ، بەبڕوای ئەوەی بەوجۆرە بەسەر داگیرکەردا سەرئەکەون ، لەکاتێکدا تورکەکان لە هەموو لایەکەوە سەربازیان بۆکوردستان ئەهێنا و بەوە وازیان نەهێنا بوو ، کە تەنیا بۆگوندە تورک نشینەکانی بەرن ، بەڵکو هۆردوویەکی زۆر گەورەیان ، کە - 25 - بیست وپێنج هەزار سەرباز ئەبوو ، بە هێڵی شەمەندەفەری سوریا ، لە حەڵەبەوە گواستەوە .

بەڵێ هێزەکانی تورک ، لە کۆتاییدا توانیان شۆڕشەکە کپ بکەنەوە و شێخ سەعید بگرن و ، بەشێک لە شۆڕشگێڕان بەلوتکەی کێوەکان ونزارە چڕەکانەوە بمێننەوە و ، بەشێکی تریان پەنا بەرنە بەرولاتی ئێران و عێراق و سوریا ، بەڵام ئەم سەرکەوتنە لەسەرتورک زۆرکەوت وزیانێکی زۆری ماڵ و گیانی تیادانا ، چونکە ئەوهێزانەی تورک بۆ سەر ئەم شۆڕشەیان کۆکردبووەوە ، بریتی بوو لە :

9 تیپی پیادەو ، 9 لیوا تۆپخانەو ، ؛ تیپی سوارە ، سەربازی ئەمانەش هەرلە تشرینی یەکەمی ساڵی 1924 - ەوە ، شەش تیپی پیادە لە - قارس - و - سیعرت - و - ماردین - و - میدیات - بوو .

زیانی تورک ، لە شەڕەکانی ئەم شۆڕشە گەورەیەدا ، گەیشتە ( 50 ) هەزارسەرباز و ئەو پارەیەشی بۆ پێویستی سەربازیانەی تورکی ، سەرفیان کردبوو ، لە ( 60 000 000 ) شەست ملێون جونیەی تورکی زیاتربوو ، چونکە رۆژنامەی - ملیەت - ی تورکی لە ژمارە 1624 - ی 9ی تەمووزی - 1930ز - دا ئەڵێ : " ئێمە ئەوپارەیەی لە ماوەی پێنج ساڵدا کە بۆتەمێ کردنی چەند جەتەیەک سەرفمان کرد ، ئەگەر بۆدروست

کردنی هێلّی ئاسنی شەمەندەفەر ، بەکارمان بهێنایە ، کەڵکی چاکتر ئەبوو بۆ وڵات " .

هەرئەوکاتە تورکەکان لەرۆژنامەکاندا رایان گەیاندکە گوایە شۆرشەکە لەناوچووەو ، شۆرشگێرانیش قڕیان لەبەربڕاوە ، بەلام ئەمانە درۆ و دەلەسە بوو، چونکە شۆرش کۆتایی نایەت و، تا تاکە کوردێک لە کوردستاندا مابێ ، شۆرشیش هەرئەمێنێ . بەڵگەش بۆ ئەمەو ، بۆ راگەیاندنە رەسمیەکانی تورک ، ئەوەبوو هەرئەو- عیصمەت پاشایەی ئەو راگەیاندنانەی دەرئەکرد، لەو وتارەیدا کەلەئاهەنگی کردنەوەی هێلّی ئاسنی ( سیواس - ئەنقەرە ) دا ، دای ناچاربوو بڵێ :

" ئەو هەراو ئاژاوەیەی ماوەی پێنج ساڵ ئەبێ لە پارێزگەکانی خۆرهەلاتدا ، بەتەفرەدان و خراپەی ئەوانەی لە ئەرەوە نیشتەجێن ، بەردەوامە ، لەمرۆ بەدواوە نیوەی هێزیان لەدەست چوو " .

تورکەکان هەروەک چۆن لەوێرانکاری و ئازاردانداهونەروەرن ، هەر بەوجۆرەش لە درۆ و دەلەسەهەڵبەستندا ، دەستێکی بالایان هەیە ، بۆیە کەوتنە ئەوەی بەئاشکرا لەملاولەولا بڵێن کورد ، شۆرشی دژی تورک نەکردووە ، بەڵکو بۆئەوەی کردووە ، خەلافەت و دەسەلاتدارێتی عوسمانی بگەڕێتەوە ، گوایە بەمە ئەیانویست بڵێن شۆرشی ئەو کوردانەی شەڕی داگیرکەرانیان ئەکەن و ، داکۆکی لەقەوارەی نەتەوایەتی و، سەربەخۆیی نیشتمانیان ئەکەن ، شۆرشی نەزانین و دواکەوتوویی و دەمارگیرییە ، دژی تیشکی زانست وشارستانێتی .

نەیان ئەزانی گەلی کورد، زۆرچاک دڵنیان ، کەکۆماری ئەمرۆی تورکیاو ، ئیمپراتوریەتی عوسمانی و ، خەلافەتی عوسمانی ، دوێنێ و هەر تورکێکی تر ، هەرگیز دان بەمافی ژیانی کورددا نانێ ، بۆیە ئەگەر دەسەلاتیی تورکیا ، بەناوی خەلیفەوەبێ ، یان بەناوی سولتانەوەبێ و، ئاینی بێ و ، نائاینی بێ ... بۆکورد لەیەک ئاستدان و،وەک یەکن چونکە هەموویان بڕوایان بەسیاسەتی دۆزەخ ئاسایە بەرانبەر کورد ، کەبریتیە لەپاکتاوان و تەفروتوناکردنی و، لەهەموو دەورانێکدا

3- رۆژنامەی - طنین - ژمارە 1626ی 3ی ئابی سالی ۱۹۳۰ز -

ده‌سه‌ڵاتداریتی تورک وخه‌لافه‌ته‌که‌یان و، عوسمانچییتییه‌که‌یان‌و کۆماره‌که‌یان ، ئه‌وه‌نده‌یان مه‌ینه‌تی وسته‌م، به‌سه‌ر کورددا رشتووه، له ژماره نایه‌ت ، له‌به‌رئه‌وه‌ی تێگه‌یشتنی تورک ، بۆ کورد چۆن بووه و، شێوه‌ی حکومه‌ته‌که‌یان هه‌رچۆنێ بێ و، ره‌نگی حیزبه‌کانیان هه‌رچییه‌ک بێ ، هه‌روا ئه‌بن و گۆڕانکارییان به‌سه‌ردا نایه‌ت ، بۆیه ئه‌بینی، کورد خۆی له تورک دووره‌خاته‌وه‌و، بڕوای پێ ناکاو، به هه‌موو چه‌کێکیش شه‌ڕی له‌گه‌ڵ ئه‌کات ، تا له‌چنگی حوکمه تونده‌که‌ی رزگار بێ .

دۆسیه‌ی دادگاکانیشیان ، که ساڵی ١٩٢٥ز ـ مه‌حکه‌مه‌ی شۆڕشگێڕانی کوردی کردووه‌و، سزای خنکاندنی پۆل پۆل و تاک تاکی به‌سه‌ردا داون، به‌ڵگه‌یه‌کی روونن ، بۆئه‌وه‌ی که شۆڕشه‌کانی کورد هه‌موویان نیشتمانی بوون و، هه‌موویان له رووی زوڵم وزۆری تورک وسته‌می مه‌غۆلی به‌رپا بوون و، تورکیش له قسه‌و، بڵاوکراوه‌کانیاندا ، له‌سه‌ر شۆڕشی کورد ، درۆزن و، بوختان که‌رن .

له‌به‌رئه‌وه‌ش که‌سه‌رژمێری تێکڕای ئه‌ودۆسیه‌وفایلانه‌ی‌وته‌ی هه‌زاران فیداکاری کوردستانیان تیایه ، بۆئه‌م نامیلکه‌یه کارێکی گرانه ، هه‌ر به‌وه‌نده وازئه‌هێنین ، که ته‌نیا هه‌ندێ قسه‌ی نادۆسیه‌ی مه‌حکه‌مه‌که‌ی ـ شێخ سه‌عید ـ ی کۆچ کردوو باس ئه‌که‌ین[٤] :

رۆژنامه‌ی ـ وقت ـ ی تورکی له‌وژماره‌یه‌یدا ، که به مێژووی ١٩ای حوزه‌یرانی ساڵی ١٩٢٥ز ـ ده‌رچووه ، له‌ژێر سه‌ردێڕی " له دۆسیه‌ی مه‌حکه‌مه‌ی شێخ سه‌عیدو هاورێکانی ـ ئیعترافه‌کانی قاسم بدگی

---

٤- له جێی خۆیدایه‌تی لێره‌دا قسه‌ی هه‌ندێ له سه‌رکرده ئه‌هیده‌کانی کورد ، له‌به‌رده‌م سێداره‌ی که‌مال ـ یه‌کاندا تۆماربکه‌ین :

شێخ سه‌عید مه‌ولانا دری ئه‌مزینی ، که چووه به‌رسێداره‌که وتی :" ئه‌ی جه‌للاده‌کان ئه‌ره‌ف مه‌دنییه بۆمان ، له پێناوی سه‌ربه‌ستی نیشتمانه‌که‌ماندا ، سه‌ربکه‌وینه سه‌رسێداره، به خنکاندنی ئێمه ، له‌ڕق و تووڕه‌بوونی گه‌لی کورد زیاتر ، هیچی تر قازانج ناکه‌ن و زیاتریش وره‌ی پێ پته‌وئه‌که‌ن بۆسه‌ربه‌خۆیی و ، سه‌ربه‌ستی ، بژی کوردستان و ، بژی خه‌باتی گه‌لی کورد .

دکتۆر فوئاد دیهی دوای هوتافی به‌زمانی کوردستاندا وتی : " ئه‌ی خوێن ڕێژان ، موا ئه‌زانن ئه‌ستێره‌ی تورک ، به‌سه‌رکێشه‌ی کورددا سه‌رئه‌که‌وێ ! گه‌لی کورد به‌ورده‌یه‌کی پته‌وتره‌وه خه‌بات ئه‌کات و ، خۆشیان بێ وترشیان بێ ، ئازادی وسه‌ربه‌خۆیی هه‌رئه‌هێنن . کتووه‌ش ئه‌ی خوێن ڕێژان ، له‌وه زیاتر که لاپه‌ره‌یه‌کی ره‌ش ئه‌خه‌نه سه‌رمێژووتان ، هیچی تر قازانج ناکه‌ن " .

بەگباشی " نووسیویتی :

" قاسم بەگ : تێکەڵ بە بەشی نهێنی ـ کۆمەڵە ـ نەبووم و، هیچ شتێ لە نهێنیەکانیان نازانم، بەڵام هەرچی دەربارەی ئەزانم پێتانی ئەڵێم " پار سێ ئەفسەر لە ئەرزەرووم بوون : توفیق سلێمانی صالح، ئیسماعیل حەقی، ئەمی دوایی پشووی ساڵانەی وەرگرتبوو، واخۆی دەرئەخست، کە بۆبەسەربردنی پشووەکەی هاتووە بۆدیاربەکر . پاشان چووە ـ ئورفە ـ و، ماوەیەک لەوێ مایەوە، دوای ئەویش چوو بۆ ـ حەڵەب ـ و لەوێوە نامەیەکی ناردبوو، بێگومان ئەبێ ـ بەتلیس ـ یش ڕێکخراوی تایبەتی سەربە ـ کۆمەڵە ـ ی تیا هەبووبێ چونکە ـ یوسف ضیاء بەگ ـ لەوێ نیشتەجێ بوو، مەبەستی ئەواویش سەربەخۆیی بوو، بۆگەیشتنیش بەو سەربەخۆییە، هەندێک خەریکی کاروباری ئاینی و هەندێکی ترخەریکی بەرنامەی سیاسیانە بوون، ئاما نجیش هەروەک یەک جیاوازیان نەبوو "

قاسم بەگ : لەراستیدا سەیید عەبدولقادرو بەدرخانیەکانکە دیارە لە ـ ئەستانە ـ نیشتەجێ بوون، چەندان ساڵ بووخەریکی پروپاگەندە بوون بۆبزووتنەوەی کورد، لەبەرئەوە تەقەللای نەپساویان گەیشتە ئەوەی ـ کۆمەڵەی بەرزێتی کوردان ـ لە ئەستانە، دابمەزرێنن کە پێیم وایە لقی لەپارێزگەو هەرێمەکاندا هەیە، ئەم کۆمەڵەیە، لەکاتی جەنگی گشتیدا، کەمێک کاری وەستا، بەڵام دوای شەڕ راگیران، لاواز بوونی حکومەتی تورک و، گەلی تورکیان بەهەل زانی و، دووبـــارە

---

ئەحمەد کەمال فەوزی ـ ش بەڕووی جەللادەکاندا ئەیڕاندی و وتی : " ئەرەفە بۆمان، لەپێناوی ئازادی کوردستاندا بمرین، بژی کوردستان و، بژی خەباتی گەلی کورد، لەپێناوی سەربەستی و سەربەخۆییدا " .

سەرکردەی شۆڕشیش شێخ سەعیدی پیران بەڕووی جەللادەکاندا قیراندی و وتی : " جێی شەرەف مەندیمانە، لەپێناوی رزگاری وڵاتەکەماندا، دژی کۆیلایەتی ـ تان خەباتمان کردووە و لەسێدارە ئەدرێین، خەباتمان ئەرکێکی نیشتمانی بوو لەئەستۆماندا، بەشەرەفەوە بەئەنجاممان گەیاند، ئەرکی هەموو کوردێکی خاوێنیش ئەوەیە خەبات لەڕێی رزگاری وڵاتەکەیدا بکات، کەکوردستانی زۆر لێکراوە لەزوڵمی لەڕادەبەدەری ئێوە " .

بەڵێ لەم هوتاف و وتە نیشتمانیانەوە، کە بۆنی پاک وانێتی وتەبەزی لێ دێت و نیشتمان پەروەری ودڵسوزی وفیداکاری لەپێناوی گەل ونیشتماندا ـ ی لێ ئەتکێ، ئەهیدانی دور ـ تان بەسەر داری سێدارەوە، پێشوازی مردنیان کرد . ئیتر ئەهیدانی کورد کەیەک لەدوای یەک، لەپێناوی کێشەی رەوای پیرۆزدا ئەهاتن، بەم وتانە رووبەڕووی جەللادەکانیان ئەبوونەوە .

کۆمەڵە - یان پێکەوەنایەوەو ، بەگەرمی کەوتنە لق کردنەوە لە هەموو لایەکدا ، ئیتر گیانێکی بەهێز لە هەمووکورددا ، تەنانەت لای خەڵکە رەشۆکیەکەش دروست بوو ، بۆکارکردن لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستان دا ، لەوکاتەشدا یەکێک لە - پاریس - دەرکەوت ، ناوی شەریف پاشا بوو، نوێنەرایەتی گەلی کوردی ئەکردو ، گفتوگۆی بۆ سەربەخۆیی کوردستان لەگەل ئەم و ئەودا ئەکرد، لەساڵی ۱۹۱۹ ز- کەیەکەمین ئەنجوومەنی نیشتمانی لەئەنقەرە ، دامەزرا ، بروسکەیەکی پیرۆزبایییم بەوبۆنەیەوە بونا ردن ، کەچی لێم توڕەبوون و، وتیان : تو کوردیت ، چۆن ئەبێ پیرۆزبایی لەتورک بکەیت وخۆشت بوێن ؟! ئەمانەلەسەدا هەشتای رای گشتیان بەلای خۆیاندا راکێشابوو، ئەشیان ویست سەرتا پای لایەنگری ئەوان بێت . ئەمەیە پووختەیەکی مێژووی شورشەکە " .

هەر رۆژنامەی - وقت - ی تورکی ، بەمێژووی 18 ی حوزەیرانی - 1925ز- بەناونیشانی " نوێنەری گشتی داوای سزادانی 53 - کەسی تاوانبار ئەکات " نووسیبووی :

نوێنەری گشتی : - ئەمشۆرشەی دوایی ، کە لە پارێزگەکانی خۆرهەڵاتدا روویدا و، ناوچەکەش گرنگترین ناوچەیەلەنیشتمانی تورکدا ، لەرووی بەرگری وپارێزگاری لەقەوارەی دەوڵەت ، لەوگیانە پیسەوە بەرپا بوو، کەولاتی - بوسنە - و - هەرسک - ی لەسێ لاوە دەورەدراوی بەدەوڵەتانی نامۆ بەتورک و، ئیسلام ، والیکردشۆرش دژی تورک بکەن و - ئەرنووط - یەکانی هانیدا ( کەپێنج سەدەیە شەرەفی ئەوەیان هەیە لەگەڵ تورکدا هاونیشتمان و برای عوسمانیین ) لەشەڕی - بەلقان -دا ، لەپشتەوە لەتورک بدەن ، کەرۆژێ لەرۆژان دریغیان بە برایەتی بێ سنووریاندا نەکردووە ، کەچی لەجەنگی گشتیدا بەسەر - سوریا - یی و - فەلەستین - دا هاتن ، ئەودەستەش کەکوردی ، دژی تورک بزواند ، هەمان ئەودەستەیە ، کەئەو گەلانەی بزواند. ئەوانەش کەئەم کارەیان کرد، چ لەناوەوە ، چ لەدەرەوە ، ئەوخائینانەن ، کەلەگەڵ زۆربەی ئەو بێ ولاتانەی نزیک سنووری نیشتمانەکەماندا ، بەهاوکاری دوژمنەکانمان یەکیان گرت .

ئه مه ش برگه یه که له وتاری سه رۆکی دادگا ، بۆئه وانه ی حوکمی لــــه سێداره دانیان به سه ردا دراوه :

هه ندێکتان خه ڵکتان بۆمه به ستی تایبه تی خۆتان به سوخره و بێـگار گرتووه و هه ندێکی تریشتان به دنه دانی بیانه ، چاوی بریوه ته نه سکه وتی سیاسی ، به م جۆره هه مووتان له یه ک خالّدا یه کن ، ئه ویش پێکـــه وه نانی کوردستانێکی سه ربه خۆیه له به رئه وه بۆئه وه ی داد بچه سپێ ، ئـه و خوێناوه ی رژاندووتانه و، ئه وماڵانه ی کاولتان کردوون ، لـــه ســـه ر ئـه م سێدارانه وه رئه گرن " .

دیسان هه ر رۆژنامه ی ـ وقت ـ ی تورکی بـه مێژووی 3 ی حوزه‌یرانی 1925 ز ـ له ژێر سه ردێری " چۆن شۆرشه که ساز کرا " دا ، ئه نووســـێ :

دیاربه کر 2 ی حوزه یران : ئه وشتانه ی ئێستا له محاکه مه کردنــــی ـ شیخ سه عید ـ دا هه ڵئه گوزرێ ، ئه مه یه " ساڵی پار ، له پارێزگه کانی خۆرهه ڵاتماندا ، کۆمه ڵه یه کی نهێنی دروست بوو ، مه به ستی سه ربه خۆیی کوردستان بوو ، گرنگترینی کۆڵه که کانی ئه م کۆمه ڵه یه و ، ئه ندامـه کانــی خه ڵک بوون ، ئه م کۆمه ڵه یه به وهۆیه وه سه رکه وت که به هۆی ـ یوســف ضیاء به گ ـ ی له سێداره دراوه وه ، توانی بنه ماڵه ی ـ شێخ سه عید ـ بـۆ لای خۆی رابکێشێ ، به راشکاویش ده رکه وت که کۆمه ڵه کوردیـــه کـــان ، شۆرشیان له ژێر په رده ی ئاییندا به رپا کرد ، تابگه نه ئاواتی خۆیان ، که سه ربه خۆیی کوردستان بوو ، له پارێزگه کانی خۆرهه ڵاتدا ، به ڵام پێــــش کاتی دیاری ـ کراوی خوی ته قیه وه " .

---

# بەزۆر ڕاگوێزانەوەو کوشتار

تورکەکان بە ئاشکرا ئەوەیان بڵاوکردەوە، کە ئاگری شۆڕشەکەی ساڵی 1925ز - یان کوژاندۆتەوە، ئینجا بە شێوەی جیا جیاکە وتنە ئەنجامدانی بڕیاری پاکتاوکردنی کوردو، تەفروتوناکردنیان. دیارە خوێنەریش ئەزانێ سەرمای سەختی کوردستان و، بە تایبەتی هی مانگەکانی کانوونی‌دووەم و، شوبات، چۆنن، کەواتە ناچارکردنی دانیشتوانی ئەوناوچانە، بۆ کۆچ و ڕەوکردن لەم دووەمانگەداو، لە وڵاتی باوک وباپیرانیانەوە، بەرەو شوێنە دوورەکانی خۆرئاوای تورکیاو، جێ هێشتنی ماڵات و زەوی و زارو، کەل و پەلیان، یانی چی؟

بەڵێ تورکەکان دەستیان کرد بە ڕاگوێزانەوەی دانیشتوانی‌بایەزید- - وپەڕی خۆرهەڵاتی کوردستانەوە، بۆئەوپەڕی خۆرئاوای تورکیا لــــە - ئەزمیر -. ئاخۆ گومان لەوەدا هەبێ کەلەسەدا، دەی، ئەم بـــەزۆر ڕاگوێزراوانە، بەوچلەی زستانە، بەسەلامەتی ئەگەنە - ئەزمیر - و دەروبەری؟

دانیشتوانی ئەوگوندە کوردنشینانەش، کە بەتۆپ وفڕۆکە کاول کران و، ئەوەی لە مردن ڕزگاریان بوو، لەژن وکچ ومناڵ، کەوەک ڕانــە مەڕ ئەدرانەبەر بۆگوندو ناوچەکانی تورک و، لەولاشەوە دەوڵەمەنـــد و فەرمانبەرانی تورک، دەستیان ئەدرێژە کردەسەر ماڵ وموڵک و ناموسیان هەرلەو ناوچەیەشدا کە شۆڕشی ئەمجارەی تیا بەرپا بوو تورکـــەکـــان کۆمەڵێکی زۆر گەورەی پیرەمێرد و کچ ومناڵ، کە ژمارەیان ئەگەیشـــتە دووهەزارکەسێک، لەگوندی جیا جیای نزیک ئەوناوەوە کۆی‌کردبوونەوە، هەمووی هێنان و، هەربەزیندوویی خۆڵی پیاکردن و کوشتنی.

بیست وپێنج خێزانی کوردیش، لە ناوچەیەکی باکوری زەریـــاچەی - وان - کە پیاوەکانیان لە ئازوڵم وزۆری تورک، پەنایان بردبووە بــەر چیاکان، تورک هاتن و، ئافرەت ومناڵەکانی ئــەم بیســـت و پێنج

خێزانەکانیان گرت و، سەریان بڕین و، سەرەکانیان لێ کردنەوە، ئەنجن ئەنجنیان کردبوون، بەشەقامەکانی شاری ـ ئەرجیش ـ و ـ مالجواز ـ وشارانی تردا، بۆتۆقاندنی دانیشتوان و تۆڵەی هەڵهاتووەکانیـــان ئەیان گێڕان .

لە پاشکۆی ئەم نامیلکەیەشدا بەژمارە، ئەوەمان روون کردۆتەوە کـە تورکەکان هەرلەسالّی ـ 1925 ز ـ ەوە تا ساڵی 1928 ز، چییان کردووە، هەرلەکاول کردنی ماڵان وسوتاندنی وکوشتنی ئافرەت ومناڵ و پـیـری بێ تاوانەوە، تا ژمارەی ئەوخانوانەی سووتاندوویانەو، ئـەوانـــەی کوشتوویانن، لەگەڵ ناوی ئەوشوێنانەی کوشتار و هەمە جۆر وێرانکارییان تیدا کردووە .

لەساڵی 1927 ز ـ یشدا، مستەفا بەگی فەرماندەی تیپی 41ی سوپای تورک گەمارۆی گوندەکانی دەوروبەری شاری ـ داراجینی ـدا و، پاشـان کەوتە تۆپ باران کردنی گوندەکان و، دانیشتوانی و یەکە یەکە یـانـی کاول کردو، کەسیانی لێ دەرنەکردن، چونکە ئەوەیشی ئەیتوانی لەژێـر گوللە تۆپەکانی ناوگوندەکەدا دەرچێ و، خۆی دەرباز بکات، کەئەگەیشتنە نزیک ئاقاری گەمارۆکە، گوللەی دەست رێژی سـەربازەگەمارۆدەرەکان، ئەیکوشتن، بەم جۆرە ژمارەی ـ 430 ـ گوندی ئاوەدانی کورد کـاول کران و، ژمارەی ئەوانەشیان کە بەسەمەرە لەئاگری تـۆپ بـــاران و سووتانکاری ئەم ناوچەفراوانە رزگاریان ببوو، هەرپەنجـا کەســـێک ئەبوون، سەربازەکانی تورک بەسەری نێزەکانیان ورگی منالانیــــان هەڵئەدڕی و بەناشیرینترین شێوە، کەبڕوانەکرێ ئەیان خستنە کلّپـەی ئاگرەوە . ـ ئەمەش وێنەی ئازاردانێکە لەوپەڕی ناشیرینیدا .

" بیگباشی حەیدەربەگ ـ ی فەرماندەی دەستەیەک سوارە، هەندێ کەسی لەدەم سپیانی شاری ئەرغەنی مەعدەن، بەتاوانی نیشـــتمان پەروەریتی کورد، گرتبوو، کەبریتی بوون لە : یـوســـف ئـەفـەندی و عەبدولرەحمان ئەفەندی ومستەفا ئەفەندی و، زۆری لێکردبوون مـــاوەی مانگێک بەشەو و رۆژ، بەپێ ولەپێش سەربازەسوارەکانیەوە بەلێدان و تێهەڵدان، رێ بکەن . بەشەویش هەریەکە ـ ٣٠ ـ سی جەڵدەی لـــێ

ئه دا ن ، پا ش ئه وه ئه بهێشت كه مێك نا ن بخۆن . ئه م حا ڵه تا ما نگێك ده وا می كرد، له دوا ییدا فه رما نی كرد، هه موویا ن پێكه وه گولله بـــا را ن بكرێن " .

ژما ره ی ئه وا نه ش كه له نیشتما نی خۆیا ن ده ركرا ن وله به ر نیشـــتما ن په روه رێتیا ن ئا زا ردرا ن ، له وما وه یه دا، گه یشته نزیكه ی ـ یه ك ملێۆ ن كه س ـ . ئه گه رئا ما رێكی ره سمیشما ن له به رده ستدا نه بێ ، بۆئه وا نـــه ی به سه لامه تی گه یشتنه ئه وشوێنا نه ی به زۆر تیا یا ندا نیشته جێ كرا ن،رێی ئه وه ما ن لێ نا گرێ به دڵنیا ییه وه بڵێین ژما ره ی ئه وا نه ی به ده م رێـوه ، له به ، سه رما و، ما ندووبوون و، برسێتی مردن ، ئه وا نه شیا ن كه به ده ستی ئه وسه ربا زا نه ی تورك كوژرا ن ، كه بۆپا سه وا نی له گه ڵ ئه م را نـــه مـــه ڕه مرۆڤه دا ها تبوون ، ئێجگا ر زۆربوون .

به كورتی توركه كا ن هیچ شتێكی نا شیرینیا ن نه هێشته وه كه نه یكه ن و، ئه وه ی له جه نگی گشتیدا له گه ڵ ـ ئه رمه ن ـ دا كردبوویا ن ، هـه موویا ن له سه ركورد تا قی كرده وه ، به بێ ئه وه ی یه كێك ده ستیا ن بگرێ ، یـــا ن شـتێ بیا ن گێرێته وه .

به نده كا نی (( 38 , 39 , 40 )) ی به شی سێیه می په یما نی ـلۆزا ن ـ كه بریتیه له وه ی حكومه تی توركیا ، به ڵێن ئه دا ت به وه ی ئه وكوردا نـــه ی به ژما ره له تورك كه مترن ، له توركیا دا ، ما فی ته وا وی ئا خا وتنیا ن هه یه له نا و خۆیا ندا و، له به ردا دگا و، بۆیا ن هه یه رۆژنا مه و، گوڤا رو كتێب بـه كوردی ده ربكه ن و، یا نه ی كوردی ـ زا نســـتیـا نه و ، كـۆمـه ڵایه تی و ، په روه رده یی ـ ش دروست بكه ن، بۆشیا ن هه یه به ئا زا دی به سه رتا سه ری توركیا دا ها توچۆ بكه ن و، هه موو ئه وما فا نه شیا ن هه بێ كه تورك پـێـیـی دراوه ، هه روه ها له به ندی (37) دا ئه ڵێ : توركیا په یما ن ئه دا ت كـه نا بێ یا سا و بڕیا ری وا ده ربكا ت ، پێچه وا نه ی ئه وما فه با سـكـرا وا نـــه ی سـه ره وه بێت .

به ندی (44) یش ئه ڵێ : ئه م په یما نا نه ی توركیا ، شتێكه ده وڵه تا ن له سه ری رێكه وتوون و، نا بێ به هیچ جورێ لێی په شیما ن بێته وه ، ئه گینا بۆهه ریه كێك له وده وڵه تا نه ی په یما نی ـ لۆزا ن ـ یا ن مۆركردووه و ، ئه و

دەوڵەتانەش کە -کۆمەڵەی نەتەوەکان- یان پێک هێناوە، بۆیان هەیە سەرپەرشتی تورکیا بکەن بۆچی بەجێ کردنی ئەو پەیمانانە، بەوردی و، لە دژی تورکیا دەست بخەنە کاروبارەکانیانەوە، تا وای لێ بکەن ئەوەی لەبەرنەم هەموو دنیادا لە ئەستۆی گرتووە، جێ بەجێی بکات.

سەرەڕای ئەم بەندە ئاشکرایەش، کەچی هەرهەوڵ و تەقەللایەک بە ناوی گەلی کوردەوە نراوە، لای -کۆمەڵەی نەتەوەکان- وئەو دەوڵەتانەی پەیمانی -لوزان- یان مۆرکردووە، بەهەدەر ڕۆیشت و لە قڕوقەپ زیاتر، وەڵامێکی تری نەبوو.

داواکانیشمان لەوەبەدەرنەبوو، کە ئەمانویست بەهۆی لیژنەکانی لێپرسینەوەوە، کە سازمان وپەیمانگا مرۆڤایەتی و، خێرخواکان ئەیان نێرن بۆکوردستان و، بۆئەوبڕیارگە تورکیانەی، کوردیان بۆ ڕاگواستووە، ئەوکوشتن وبڕینەیان بخەینە بەرچاو، کە تورک لەوناوچانەدا بێ بەزەییانە، دژی کورد کردوویەتی.

تورکەکان ئەگەربێ بەری بوونایە لەوتاوانانەی کە درایە پاڵیان، ئەبوایە بیەڵێن ئەولیژنانەی لێپرسینەوە بنێردرێن بۆگەڕان بەکوردستان و ناوهاونیشتمانیە کوردەکانماندا. بەڵام تاوانبار وشارەرەوەی تاوانن و، تا وڵاتیش هێزێکی وای تیانەبێ ڕێی ئەوتاوانانەیان لێ بگرێ؛ چییان کردووە، هەرئەیکەن. لەبەرئەوەئەمیانبینی هەرچیان لەدەست دێت، بۆداپۆشینی ئەوکوشتن و بڕین وستەمەی بە دزییەوە لە کوردستاندا پەیڕەوی ئەکەن.

— — — — — —

# کۆمەڵەی خۆیبوون ـ ی کورد

بەلەناوبردنی شۆرشی کوردی سالی - 1925ز - هەرتەنیا تورک زیانی سەرومالی لێ نەکەوت ، بەڵکو کوردیش بەختی وای هێنا زیانی لێ بکەویت و، هێزەکەیشی لەدەست بدات ، هەرچەندە بەسەرکەوتنی کێشە پیرۆزەکەی لەق نەبوو، ئەم بڕوایەشی کاری خۆی لەدڵی ئەونیشتمان پەروەرانەی کورددا هەبوو، کە بەکێوە سەرکەشەکانی کوردستانەوە مابوونەوە، یان ئەوانەی وەک پەنابەر بەولاتانی ئێران وسوریا وعێراق و میسر و ئەورووپادا پەرش وبلاو ببوونەوە .

نیشتمان پەروەرانی کورد کەسەیریان کرد نیشتمانەکەیان لە دوای شۆرشی سالی 1925ز - بەهۆی ئەوبەرنامە توندوتیژەو رەفتاری رەقی مەغۆل ئاساوە ، کە تورکەکان بەکاریان هێنا ، چ دەردەسەری وکلۆڵییەکی بەسەردا هات . بۆیە لەسالی 1926ز - دا خۆیان ئامادەکرد کۆنگرەیەکی گەورەی کوردی ببەستن و، هەموو نوێنەرە سەرەکییەکانی کوردی تیا بن ، هەرلە نوێنەرانی کۆمەڵەکانەوە، تاسەرۆک هۆزو ، پیاوانی ناسراوی ولات وخاوەن دەسەلاتەکان ، بۆئەوەی بڕیاری بەپەلەو کاریگەرانەی تیا بدەن ، تاپێش ئەوەی تورک بتوانێ هۆزە ئازاکان پەرش و بلاو بکاتەوەو، ئەوەیشی لە نیشتمان پەروەرانی کورد، ماوە کە هێشتا بە شاخەوەن، سەرلەنوێ خەبات بۆرزگاری کوردستان ، دژی تورک دەست پێ بکەنەوە . لەبەرئەوە نیشتمان پەروەرانی کورد، لەوکۆنگرە گەورە کوردییەدا سەرکەوتن ، کەسالی 1927ز - لەناوقەڵەمرەوی تورکیادا ، واتە لەوناوچە کوردنشینانەدا گرتیان کەلەژێر دەسەلاتی تورکدابوو..

کۆبوونەوەکانی کۆنگرەکە ماوەی مانگ ونیوێکی خایاندو، لێ بڕیاری ئێجگار گرنگی تیا درا ، کەئەمانە یان لێ باس دەکەین :

1- هەڵوەشاندنەوەی هەموو کۆمەڵە کوردییەکان ، تاڕێ خۆش بکات بۆدامەزراندنی کۆمەڵەیەکی گەورەی کوردی ، کەگشت ئەندامانی کۆمەڵە

کۆنەکان و، ئەندامانی تازەش لەخۆیدا کۆبکاتەوە .

2- ئەریژە پەیدانی شۆڕش وخەبات دژی تورک ، تا دوا سەربازی تورکی ، خاکی پاکی کوردستان ، بەجێ ئەهێڵێ .

3- لەستپێکردن بەشۆڕشی سەرتا سەری و، ئەمانەرە چاو بکرێن :

ا ـ دانانی فەرماندە یەکی گشتی بۆهەموو هێزە نیشتمان پەروەرەکانی کورد.

ب ـ رێکخستنی هەموهێزە شۆڕشگێڕەکان ،لەسەرشێوەی سەربازی وجەنگی و، چەکدارکردنیان بە تازەترین چەکی شەڕکردن و جەنگ .

ج ـ دامەزراندنی مەڵبەندێکی گشتی بۆشۆڕش وسەرکردایەتی بالا، بۆهێزەنیشتمان پەروەرەکانی کورد، لە یەکێک لە چیا سەختەکانی کوردستاندا .

4- دروستکردنی پەیوەندی برایەتی و هەمیشەیی وبۆنەی دۆستایەتی لەگەڵ حکومەتی ئێران و گەلی فارس ـ ی برادا .

5- دروستکردنی پەیوەندی برایەتی و دۆستایەتی هەمیشەلەگەڵ هەردووحکومەتی عێراق وسوریا . لەوسنوورەشدا ئەوما فانە بەبەس بزانن، کەلەگەڵاڵەی ـ ئینتیدا ب ـ وپەیمانی نێوان دەوڵەتاندا سەبارەت بە مافەکانی کورد هاتووە ، لەم دوودەوڵەتەدا و، داوانەکردنی هیچ مافێکی تری سیاسی ، لەم دوو حکوومەتە ، لەوەزیاتر کەهەیە .

" خۆیبوون " لەماوەیەکی کەمدا ، توانی سەدان لق‌لەناوکوردستان و دەرەوەو تەنانەت لەئەوروپاو لەئەمەریکا ـ ش دا ، دابمەزرێنێ ، پەیتاپەیتاش لەهەموولایەکەوەو لەهەمووجۆرێک ئەهاتنە ژێرئالای ئەم کۆمەڵەیەو، لقەکانی و، مەڵبەندی گشتی کۆمەڵەش ، پێکەوەنانی رێکخستنی سەربازیانەی لە ـ ئاگری داغ ـ بە ئیحسان نووری پاشا[1]سپارد، کەزۆربەچاکی ئەم کارەگرنگەی بەئەنجام گەیاند ، چونکە ناوچەیەکی سەربازی کوردی ، لەوکێوە سەرکەشە کوردییە دامەزراند،لەو پەڕی قایمی وسەختیدا بوو.

---

1- ئیحسان نوری پاشا لەسالی 1892 ز ـ لەشاری ـ بەدلیس ـ لەگەڕەکی ـ ئالی گولی ـ لە دایک

ناردنی ناوبەناوی دەستەی پارتیزانی نیشتمانی بۆ ئەوجێگایانەی کە فەرمانبەرانی تورک، گۆشت وبڕی بێ تاوانی کوردیان تیائەکردو، سەرکەوتنی ئەوهێزە کوردیانەی لەم ناوچەیەوە ئەچوون بۆسەرنەگرتنی ئاوارەکردنی گوندنشینە کوردەکان، بۆ وڵاتی تورک، بەپێی بەرنامەی حکومەتی تورک و، فراوان بوونی رۆژلەدوای رۆژی دەسەڵاتی ئەم کۆمەڵەیەی کوردو، سەرنەگرتنی تەواوی ئەوهێرشە گەورەیەی کە حکومەتی تورک ساڵی 1928 ز- بردیە سەرناوچەی ئاگری داخ ... هەمووئەمانە وایان کرد، کە تورک سیاسەتی خۆی بەرانبەر ئەم ناوچەیە بەشێوەیەکی کاتی بگۆڕێ. لەبەرئەوە دەستیان کرد بەفرت وفێڵ و، یاسایەکیان دەرکرد ناویان لێنا "یاسای لێبوردنی گشتی" و، بەدوای ئەمیشدا یاسایەکی لێبوردنی گشتی - یان دەرکردو، ئاوارەکردن وڕاگوێزانەوەیان راگرت و، رێگایان دا بەوڕاگوێزراوانەی کە هێشتا ماون، تا بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆیان و سەرپەرشتارێکی گشتی - شیان بۆ بەڕێوەبردنی کوردستان دامەزراند، کە هەموودەسەڵاتێک لای خۆی بوو - Vice Roi - دوای ئەمانەش داوایان لەکوردکرد چەک دابنێن و، مل بۆ حکومەتی تورکی بدات. وکۆمەڵەی - خۆیبوون - ی نیشتمان پەروەری کوردیش هەڵبوەشێننەوە.

بەڵام ئەم فێڵە ئاشکرایە، بەڵکو ئەم خەڵەتاندنە کێلۆکەیە تاکەیەک کەسی لەخشتە نەبرد، چونکە رووداوە نزیکەکان و تاقیکردنەوە تاڵەکانی

---

بووەو، دوای دەرچوونی لەقوتابخانەی جەنگی لەئەستەمووڵ، وەک چەندان هاوڕێی تری ئەفسەری کوردزمان، جوامێرانە لەجەنگی رزگاری تورکیادا، بەشداری کردووە، بەڵام دوای ئەوەی سەرکردەکانی کۆماری تورکیا، لەوپەیمانە پەشیمان بوونەتەوە، کە گوایە سەربەخۆیی ئەدەن بەکوردستانی تورکیا، ناچاربووە لەگەڵ شۆڕشگێرانی کورددا بەشداری ئەوزنجیرە شۆڕشانە بکات، کەتا ساڵی ١٩٣٠ ز - لە کوردستانی تورکیادا بەرپابوون، بەتایبەتی لەشۆڕشی - ئاگری داخ - دا کەخۆی سەرکردایەتیی کردووە، ئیتر دوای سەرنەکەوتنی، پەنای بردۆتە بەرئێران وتا دواپین رۆژانی تەمەنی لەئاوارەیی و دەربەدەریدا بەسەریبردووە، کە (46) ساڵی خایاندووەو، لەساڵی 1976ز - ناکۆچی دوایی کردووە

لەتەمەنی ئاوارەییدا دووکتێبی نووسیوە: راپەڕینی ئاگری داخ - و ژیانم. هاوسەرەکەی کە هێشتا ماوەولە - تاران - ئەژی، کتێبی - ژیانم - ی ئیحسان نوری پاشا - ی پێشکەش بەئەنستیتۆی کوردی کردووە "لەپاریس و، ئەنستیتۆی ناوبراویش لەگۆڤارەکەیاندا - هیوا - لەژمارە (2) ەو دەستی کردووە بەبڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە، بەزنجیرە گۆڤاری (هیوا - ژمارە - 2 - پاریس) - (م)

تا ئێستاش لە بەرچاون ، لە بەرئەوە خەڵکی کوردستان تۆسقاڵی دوودڵییان بۆرەت کردنەوەی ئەم چاوبڕکێ تورکیە نەنواندوزۆرجوامێرانە وتیان : تا دوا سەرباز و فەرمانبەری تورک خاکی کوردستان بەجێنەهێڵێ و ، تا تورکیا دان بە سەربەخۆیی کوردستاندا نەنێ ، ئەم شتانە نابن و، ناکرێن .

—— —— —— —— —— —— ——

## باری ئێستا

تورک ، کاتێ لە هەموو ئەو هێرشە سەربازیانەدا ، کە سالانی 1928- 1929ز - بۆسەرناوچەی ئاگری داغ - ی کرد، کە مەڵبەندیکی سەربازیانەی کۆمەڵەی - خۆیبوون - ی کوردی بوو، دووبارە لە کۆتایی نیسانەوە ، تا سەرەتای حوزەیرانی ساڵی 1930 ز - خۆیان ئامادە کردەوە بۆهێرشێکی تری سەربازیانەی زۆرگەورەوفراوان ، بۆسەرچیای ناوبراو و خۆیبوون - یش لە وبڕوایەوە کە هێشتا کاتی تەقینەوەی شۆڕشە گەورەکە نەهاتبوو، بەرنامەی بەرگری کردنی بەچاکترزانی ، وەک لەوەی هێرش بکات ، کەچی تورکەکان ئەمەیان بەلاوازی وپرزەلێ برانی کۆمەڵەی ناوبراو زانی ، بۆیە پێیان وابوو هەروا لەچەندرۆژێکدا ئەتوانن چیای ئاگری داغ بگرن .

بەلام ئەم کۆمەڵەیە ، کەچەندساڵێک بوو چیای ناوبراوی کردبووە مەڵبەندێکی سەربازیانەی خۆی ، دۆش دانەما ، بۆ ڕەنگ ڕشتنی بەرنامەی بەرگریانە ، بۆبەرپەچدانەوەی هێرشی تورک بۆسەرئەم چیایە ، کە (3) مانگ بووخۆیان بۆئامادە ئەکرد، مەبەستی تورکیش لەم هێرشە بەربلاوەیدا بۆئەوە بوو ئالای کورد، لەوسەرکێوە سەرکەشەدا بگرن و، ئەو هێزە نیشتمانپەروەرە ڕێکخراوەش پەرش وبلاوە پێ بکەن ، کە لەبارەوو بۆئەوەی گەرای سوپایەکی شۆرشگێری تیا بخرێ بۆگەلی کوردی بە شخورلو بەلکولە ناوبراویش ئەگەربۆیان بکرێ دیسان لە بەرنامەکەیاندا مەبەستیان ئەوە بوو هیچ شتێ دەربارەی ئەم هێرشە سەربازیانەو، ئەم

نا وچه شورشگێڕه کوردییه بڵاونه که نه وه ، تا به ته واوی ده ستی به سه ردا ئه گرن ، بۆئه وه ی که س ئاگاداری ته واوی باری کوردستان ، نه بێ لەبەر ئه وه هه رچی په یوه ندی هه بێ به کۆکردنه وه ی سه رباز وتیارندنی ئازووقه و ته قه مه نیه وه به ره وسنووری خۆرهه ڵات بۆسه رکورد، له رای گشتی تورکیا و وڵاتانی تری بشارنه وه .

له به ره به یانی 11 ی حوزه یرانی 1930 دا هێزه کانی تورک رووه و چیای ـ ئاگری داغ ـ کشان و، ڕێگا شاخاوییه سه خته کانیان گرته به ر و ماوه ی ( 3 ) ڕۆژ به ناونزاروگیادا رێیان کرد، هێزه کانی کوردیش لـه م چیا سه رکه شه دا ، بێ ده نگ خۆیان لێ مه ڵاس دابوو، ئیتر تورک هه ر ئه وه نده ی زانی له هه موولایه که وه ئاگری شۆرشگێڕان ،هه رله ـئینديز ـ و ـ ته ندرک ـ ،وه ، تا ـ وان ـ و ـ ئه رجیش ـ و ـ کێوی ـ سوبحان ـ به ربووه وئه وله شکره یان ، که ئابڵوقه ی کێوه که ی دابوو، له به رئه وه ناچار بوو وازله هێرش بهێنێ بۆسه رچیاکه ،و ، له جێی خۆیه وه به رگری بکات له م په لاماره ی که له هه موو لایه که وه ئه کرێته سه ری .

ئیتر شه ڕله 13ی حوزه یرانه وه ، تا 13ی ته مووز درێژه ی کێشاو ، تورک زیانی چه ندهه زارکوژراو وبریندار و، 12فرۆکه و 60 تۆپ و60هه زار گولله تۆپ و په نجا مه تره لۆز و، 150چادر و، 3هه زار تفه نگ 50 بار ئازووقه ی لێ که وت . زیادله 4 هه زارکه سیش له هێزه کانی تورک هه ڵهاتن ، که ته نیا فه یله قی 7, 8و، پاشماوه ی چه ندفه یله قێکی تر،له کێوی ئاگری داغ ـ مابوونه وه ، که نه ک هه رهێرش وپه لاماریان بۆسه ر هێزه کانی کورد بۆنه ئه کرا ، به ڵکو به رگرییان له خۆشیان بۆنه ئه کرا .بۆیه ده سه ڵاتدارێتی تورک،ناچاربوو بانگی موالیدی ( 1901, 1902, 1903, و 1904, 1905 ) بکات به م جۆره ناچاربوون ئه م هێرشه ، تاسه ره تای تشرینی یه که م ،ڕاگرن .

که کارگه یشته ئه م ئاسته له کوردستاندا و، ده سه ڵاتدارێتی تورک نه یانتوانی هه واڵه کان له رای گشتی بشارنه وه ، به تایبه تیش دوای بانگ کردنی ئه وموالیدانه ، چیروکێکی تریان رێکخست ، گوایه ئه م هه موو کاره سه ربازیانه بۆئه وه بوون ، که چه ته و دز ، له ناو بنه وه هه ڵبیان .

کوتا بووە سەرسنووری تورکیا و ئاژاوە و خراپەیان لە وناوەدا دەست پێ کردووە ، بەڵام کەبزووتنەوەکە بەربڵاوتربوو ، وتیان گوایە هەندێ کوردی شەڕانی ونەزان ، لەناوخۆی وڵاتدا ، بەقسەی خراپی ئەوانەیان کردووە ، کەپیلان وئاژاوە بۆکوماری تورکیا دروستئەکەن . لەدوا پیشدا کەناچار بوون لەسەرتاسەری تورکیادا ،بانگی موالیدی گشتی بکەن وهیچیان پێ نەکرا لەوەزیاتر دان بنین بەوەدا کەهێزەکانیان لەبەردەم هێزەکانی کورد دا تێکشکاوە ، کەتەواو ڕێکخراو و مەشق پێ کراوە و پڕچەک کراون بە تۆپ و تفەنگ ومەترەلۆز و فەرماندەی کارامەی کوردی سەربە کۆمەڵەی - خۆیبوون - ی کورد، کەنیازی سەربەخۆیی کوردستان و رزگاری کوردە ، لەحوکمی تورک .

سەرئێشەی تورک ، هەربەتەنیا بەدەست کوردی تورکیاوە نەبوو،بەڵکو لەوەتێپەڕی و، زۆربەی کوردی سوریا وعێراقیش ، هێزی تری کوردییان پێکەوەناو، سەرەڕای ئەمەش ، هەردووحکومەتی ئینگلیز و فەرەنسا ، ڕێیان لێ گرتبوون ، بەڵام هەرنارديانەنە ناوەوەی سنووری تورکیا، بۆ یارمەتی دانی براشۆڕشگێرەکانیان ، کەماوەی سێ مانگ ئەبوو ئەجەنگان .

---

## ـ ده‌ست دریژی بێ شومار و کوشتاری تازه

تورکه‌کا ن دوا ی ئه‌وه‌ ی له‌ به‌را نبه‌ر هێزه‌ چه‌کدا ره‌کا نی کورد دا دۆش دا ما ن ، ها تنه ویژه‌ ی کورده بێ چه‌که‌ بێ تا وا نه‌کا ن و که‌وتنه‌ ئه‌وه‌ ی زۆر به‌ توندی تۆڵه‌ یا ن لێ بسێننه‌وه‌ ، بۆیه‌ زۆربه‌ توندوتیژی ئه‌م کاره درندا نا نه‌ یا ن له‌گه‌ڵدا کردن :

1- به‌ بیا نووی به‌رپا بوونی شۆرشی ـ ئا گری دا خ ـ ه‌وه‌ ،ژما ره‌ ی (320) گوندیا ن کا ول کردودا نیشتوا نی ئه‌م گوندا نه‌شیا ن ،که‌ژما ره‌ یا ن(000 10) ده‌ هه‌زا رکه‌س بوون و، هه‌موویا ن پیرو منا ڵ وئا فره‌ت بوون ، له‌ دۆلـــی ـ زیلان ـ دا ، کۆکردنه‌وه‌ و، به‌ فرۆکه‌ ئا گربا را نیا ن کردن به‌ ناشیرنتریــــن

شێوه‌ هه‌موویا ن له‌نا وبردن .

2- زیا تر له‌ ( 100 ) رووناکبیری نیشتما ن په‌روه‌ری کوردیا ن گــرت و هه‌ربه‌ زیندوویی خستیا ننه‌ زه‌ریا چه‌ ی ـ وا ن ـ ه‌وه‌ .

3- له‌ ده‌وروبه‌ری ـ جۆڵه‌ مێرگ ـ ی مه‌ڵبه‌ندی هه‌کا ری (300)سێ سه‌د گوندیا ن سوتا ندو زیا ترله‌ 500 ) پێنج سه‌د ئا فره‌ت ومنا ڵی دانیشتووی ئه‌ونا وه‌ یا ن به‌ درنده‌ترین شێوه‌ کوشت .

4- له‌ نزیک هه‌ردووچیا ی ـ ئا گری دا خ ـ و ـ ته‌ندرک -400- چوا ر سه‌د گوند ـ یا ن کا ول کردو، گوندنشینه‌کا نیشیا ن به‌ بۆمبا ی ئـا گــرا وی کا ول که‌ر ، له‌نا وبرد .

5- ئه‌وهێزا نه‌ ی تورک ، که‌ به‌ فه‌رما نده‌ ی ـ جه‌وا دپا شا ـ له‌ پا رێزگه‌ ی ـ هه‌کا ری ـ یه‌وه‌ هێرشی رووه‌و ـ بیت الشبا ب ـ ئه‌ هێنا به‌ ده‌م رێگا وه‌ هه‌رگوندێکی شۆرشگێرا نی بها تبا یه‌ رێ ، یا ن یا رمه‌تی شۆرشگێرا نـــــی دابێ و ، هه‌موویا ن سووتا ند، که‌ ژما ره‌ یا ن گــه‌یشته‌ ( 120) سه‌ دوبیــست گوندو کێڵگه‌ .

6- ئه‌وهێزا نه‌شیا ن که‌ به‌ فه‌رما نده‌ ی ـ که‌ما له‌دین سا می پا شا ـ له‌

پارێزگای ـ وان ـ ەوە بەرەو ـ چاڵدێران ـ هێرشی ئەهێنا ،بەدەم ڕێوە ( 83 ) هەشتاوسێ گوندی کاول کردو ( 590 ) پێنج سەدو نەوەد کەسیشیان کوشت .

7- پشکنەری گشتی پارێزگەکانی خۆرهەڵات ـ کە ئەوکاتە لە ئەستانە بوو ـ هەرخەریکی ئەوە بوو کۆبوونەوە لەگەڵ سەرۆک کۆماری داگیرکەر و وەزیری ناوخۆیا بکات بۆدۆزینەوەی ڕێگای بنەبڕکردنی هەموو بزووتنەوە یەکی شۆڕشگێڕانە لەکوردستاندا ـ وەک خۆیان ئەیان وت ـ کە بریتی بوو لەمانە :

1- هەڵتەکاندنی ژیانی هۆزایەتی و، دابەش کردنی ئەندامانی هۆزگەلەکانی کورد ، بەسەر پارێزگەکانی تورکدا .

2- چەک کردنی هەموو دانیشتوانی پارێزگەکانی خۆرهەڵات .

3- ڕاگواستنی دانیشتوان ، لە گوندێکەوە بۆگوندێکی تر، بەجۆرێ کە بنەماڵە یەکی گەورە ، پێکەوە لە یەک گوندا نەهێڵنەوە .

4- بەتورک کردنی دانیشتوان بەزۆرەملێ وقەدەغەکردنی ئاخاوتن و نووسین وخوێندنەوە بەزمانی کوردی ( ڕۆژنامەی ـ الاحوال ـ یبەیروتی 13ی ئابی 1930 ) .

ئێمە هەرئەوەندە ئاگاداری ئەوکوشتارو بێ مروەتییە ین ، خواش ئەزانێ چ ناڕەوایی ودڕندە یەتیەکی تریش ڕوویدابێ ، کەموچورکە بەلەشدا دێنێ و، مرۆ قێزو بێزی لێ ئەکاتەوە .

ـ لیژنەی جێ بەجێ کردن ـ لە نووسینگەی کرێکارانی سۆشیالیستی دەوڵەتان ـیش لە ـ زۆریخ ـ هەرکەئەو ناڕەوایی ودڕندایەتیەی تورکی پێ ڕاگەیەندرا ، کەلەکوردستاندا ئەیکات ، ڕۆژی ( 30ی ئابی ساڵی 1930ز ) ناڕەزایەکی دەربڕی ، والێرەدا وەک لەرۆژنامەی ـ الاهرام ـ ی میسریدا بەمێژووی 9ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1930ز بڵاوکراوەتەوە ، ئەینووسینەوە :

# کوردو نووسینگەی کرێکارانی سۆشیالیستی

"لیژنەی جێ بەجێ کردن ، لە نووسینگەی کرێکارانی سۆسیالیستی دەوڵەتان سەرنجی دنیا بۆئەوکوشتارکارییە رائەکێشێ ،کە حکومەتی تورکیا ، بەرانبەر ئەو کوردانەی ئەکات ، کە خەبات بۆ سەربەستیان ئەکەن ، بەڵکو هەربەگشتی بەرانبەر ئەوهەمووکەلی کوردە شیاو زار چەشتووەی ئەکات ، کە بەشداری بزووتنەوەکەیشی نەکردووە ، بەمەش تورکەکان ئەیانەوێ بەودەرنەیان ەرن ، کە بەئەرمەن - یان برد،ئەمە ئەکرێ و رای گشتیش لە دەولەتەگەورەکاندا ، نارەزایی بەرامبەر ئەو درندایەتیە دەرنابرێ . هەروەها - لیژنە - سەرنج بۆئەو مەترسیە رائەکێشێ ، کە سوپای تورک راستەوخۆ دری بەخاکی فارس داوەوئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆئەوەی کەلیژانی جیهانی و، دەوڵەتی ، دەرەقەتی رێگاپێ گرتنی ئەو داگیرکردنە نایەن ، کەهێزگەلی سەربازی خاکی گەلێکی لاواز داگیرئەکات .

لیژنەی جێ بەجێ کردن بانگی جیهان ئەکات ،بۆنارەزایی دەربڕین بەرانبەر بەوکارەساتەخوێنا ویانەی لەکوردستاندا روودەدەن و، گەلی کوردی تیا بۆتە قوچی قوربانی .. تاد "

ئێمەش لەسەر لاپەرەکانی ئەم نامێلکەیە ، بەناوی قوربانیەکانی نیشتمانی کوردی بەش خوراوەوە ، سوپاس گوزاری خۆمان پێشکەش بە لیژنەی ناوبراوئەکەین ، کەبەو نارەزایی دەربڕینە ، بۆ داکۆکی لە خەباتگێرانی رێگای نیشتمان و سەروەریەمێژووییەکانی مرۆڤایەتی شەرەفمەند کرد .

(هذا ضريح كردستان الخيالي) صورة وضعها الأتراك لطمس فكرة استقلال كردستان

لەم وێنەیەدا ، کە تورک وەک رەمزێکی خەیاڵیی ، بـــۆ رووداوەکانی ئەم دواییەی کوردستانی داناوە و مرۆزن... م، ـ ملیـەت ـ بلاوی کردەوەو، لە سەرکێلی گۆڕەکەی نووسیوە " ئەمە گۆڕی کوردستانی خەیاڵییە " !

چاکتریش وا بوو رۆژنامەی - میلیەت - ناوی بنێ گۆڕی سەربازی گومناوی رێگای سەربەخۆیی دوا رۆژی کوردستان " چونکە بەگوێرەی ئەوەی ئەو ، سەربەخۆیی نەتەوەی کوردی بەخەیاڵ ها تۆتە بەرچاو ، ئەوەیشی هەربەخەیاڵ زانیووە .. بەلام حکوومەتەکەیشی بەهەڵەدا چووبوو ،کاتێ کەسەربەخۆیی - صرب -و - بولگار - و - دورگەی عەرەب -ی بەجۆرێک لەخەیاڵ ئەزانی . تورکیش هەرچەندە داروباری دۆخیشی بگۆڕدرێ ، بیرکردنەوە سەرسەختانەکەی هەرنا گۆڕێ ...

کوردستانیش رۆژێک هەردێت ، وەک دوێنێ - یەمەن - ببێتە گۆڕستانی تورک . لەبەرئەوە لەهەرکوێ ئەیانەوێ ، باگۆڕبۆ خۆیان هەڵکەنن و ، گۆڕەکانیشیان لەسەروێنە نەبێت ، بەڵکولەسەربەردبێت .

— — — — —

# پوختەی قسە

ئەبێ تورک لەوە دڵنیا بێ ، ئەورۆژەی حسابی ئەوخوێنە پاکەیان لەگەڵ ئەکرێ ، کە بەناڕەواو، بەزۆرداری لەکوردستاندا ڕژاندیان ، زۆر لەوە نزیکترە ، کە خۆیان ئەیزانن ، یان ئەیڵێین ... سەرلەنوێ کۆکردنەوەی سەدان پیرومناڵ وئافرەتی بێتاوان و بێ چەکیش لە یەک شوێندا و، پاشان لەناوبردنی هەمووشیان ، وەک چۆن - دوێنێ - لەگەڵ - ئەرمەن -دا کردیان ، گەلی کورد نەلەیادی چووەو ، نەلەیادیشی ئەچێ .

ئەبێ ئەم زۆردارو ستەمدارانە ئەوە بزانن کە رۆژگاریان هەروا درێژە ناکێشێ ، تاورگی ئافرەتانی کورد ، بەنێزەوخەنجەر هەڵدڕن ، چونکە کورد هەرئەبێ تۆڵەیان لێ بسێنن و، جیهانی هاوبەشی مرۆڤایەتیش هەروا بێ دەنگ نابێ لە عاستی ئەوکلۆڵییەی کورد دا ،کە توركی داگیرکەر بەسەریاندا ئەباریێت و، رۆژێک هەرئەبێ لە رووی ئەو زۆرداریەدابوەستن و ، زۆرلێکراو،بەسەرزۆرداردا سەربخەن . ئەی چۆن مرۆڤایەتی لە سەربڕینی ( 5 ) پێنج ملیۆن بێ تاوان و، لەناوبردنیان ناپرسێتەوە، کەوەک ڕانەمەڕ بەئاگری تورک وکەرەستەی تێکدەریان لەناوئەچێ !؟

گەلی کوردی نەبەز ، کەچەندهەزارساڵێک ، پێش ئەوەی تورک هەڵبکوتنە سەرئەم وڵاتەی ئێستایان هەرلەم وڵاتەدا بوون ،بۆیە ناتوانێ بەوچاوەسەیری خۆی بکات ، کەلەبەرچاوی تورک سووک و ڕسوایەو، بە سواڵ کردن ! سواڵی مافەکانی خۆی ئەکات و، لاوازەو، وەک چۆن دز و جەردەوناچیز ، راوئەنێن ، ئەمیش ئاواله شاخ وشارەکانی خۆیدا راو ئەنرێ .

حکومەتەکانی ئنگلتەرە وفەرەنساو ئێران کەلە ؟ ەڵ تورکیادا پەیمانی دۆستایەتیان مۆردکردووە، یەکەمیان ودووەمیان ، بەو پێیەی پەیمانی - لۆزان - یان مۆرکردووە ، لەکۆمەڵەی نەتەوەکاندا ئەندامن

و ، سییه میشیان که ئه ندامێکی خۆرهه ڵاتیانه یه ، له کۆمه ڵه ی ناوبراودا ، له ژێر ئه وپه یمانه دا درێغیان له خۆکه ڕکردن نه کردووه بۆبه رگری مرۆڤانه له سه ر گه لێکی ژێرده سته که له ناوبردن و پاکۆدان چاوه ڕێی ئه که ن ،به ڵکو ڕێی پشتگیری ویارمه تی دانی تورکیاشیان گرتۆته به ر ، بۆئه نجامدانی به رنامه خوێناویه کانی ..

- عیصمه ت پاشا - له یه کێک له وتاره کانیا ئاوا ئه لێ :[1]

" له م وڵاته دا له تورک زیاتر که سی تر مافی ئه وه ی نییه بلێ قه واره ی نه ته وه یی و نیشتمانیم هه یه ، ئه م ڕاستیه ساده یه ، دوای ئه وه ی ئه م هێڵی شه مه نده فه ره ئه گاته سنوور و ، که لێنه کانمان چاکتر ده رئه که وێ و ده رفه تی گومان و هه ل نادات بۆبه رپاکردنی که تن گێڕی و شۆڕش هه ڵگیرساندن ... "

عیصمه ت پاشا - کاتێ به م قسانه هه ڕه شه ی ئه کرد ،له لایه کی تریشه وه ئه وه ی سه لماند ، که ئه گه رچی هێڵی شه مه نده فه ر ، له هه مووکات وله هه موو جێگایه کدا ، گه وره ترین هۆی شارستانێتی وئاشتیه ،له هه مان کاتیشدا کوشنده ترین ئامێری تێکدان وبه زه برترین هۆی له ناوبردن و په رێشان کردنه ، ئه گه ر له ده ست تورکدابێ .

ئێمه ش که له به رده م ئه م کێشه و گیروگرفتانه داین و ، هه موویان ئه چنه پاڵ یه کتری ، ناتوانین ده ست به رداری خه باتی پیرۆزمان ببین و ، نه ته وه شیرینه که مان له ژێر به زه یی حکومه تێکدا فه رامۆش بکه ین ، که وه زیری - داد - ه که ش ، به هه مووجه ربه زه یی وئاشیرینی وئاشکرایه که وه که خه ڵکێکی زۆریش گوێی لێ بێ ، بڵێ :

" بڕوا و تیوری من ئه مه یه :- با دۆست و دوژمن و ،تا -چیاش بزانێ ، که تورک سه رداری ئه م وڵاته یه و ، ئه وه ی له خوێن وکرۆکدا ، تورک نه بێ ، له مافێک زیاتر ، هیچی تری نیه ، ئه ویش ئه وه یه :

ئه بێ نۆکه رو کویله بێ ، ئێمه له وڵاتێکدا ین ، له هه موو وڵاتانی دنیا زیاتر ، ئازادی تیایه ، ئه مه تورکیایه ده رفه تیش له مه گه وره تر رووناداتە ،

---

1- له و وتاره یدا که له ئاهه نگی کردنه وه ی هێڵی ئاسنینی ( ئه نقه ره - سیواس ) دا دای ، وه ک له رۆژنامه ی - ملیه ت - ی رۆژی ٣٠ ی ئابی سالی 1930 ز - دا بڵاوبوته وه .

بۆئەوەی نوێنەرەکانتان بیروڕایان هەرچییەکە، بیدرکێنن، لەبەرئەوە ئەمبینن سۆزو هەستی خۆم لەکەس ناشارمەوە ".[2]

بەڵام ئەونەتەوەو دەوڵەتانەی لەئەرکی مرۆڤایەتی هەڵدێـن ولەبەر دەستکەوتێکی ئابووری، دۆستایەتی تورکیا ئەپارێزن و، هەڵوێستی ساردیان بەرانبەر خەباتی نیشتمانیانەی خۆی هەیە، ئێمە هەڵسەنگاندنی ئەم هەڵوێستەیان ئەهێڵینەوە بۆبڕیاری ویژدانی نەوەکانی داهاتوو.

کۆمەڵەی - خۆیبوون - ئەلەنیشتمان پەروەران پێکهاتووە، سەرەڕای هەرچی گیروگرفت وتەنگ وچەڵەمەش هەیە، سورەلەسەر پەیڕەوکردنی خەباتی نیشتمانی، تائەگەیشتن بەئاواتی پیرۆزو، بەدڵێ پڕلەبڕوا و، عەشقی قوربانی دانەوە، رێگا ئەگرێتەبەر وچرای مێژووی کورد و رابوردووی گەش وبێگەردی بەدەستەوە ئەگرێ وهێزی خۆیشی لەئاگر و ژیلەی گەشاوەی دڵی نەتەوەی کوردی مەزن وکێشەرەواکەیانەوە ئەگرێ.

بەڵێ - رەنگە جاروبار تورک لەهەندێ جێگادا بۆی هەڵکەوێ هەندێ سەرکەوتنی ناوخۆبەدەست بهێنێ و، بەدرۆ و دەلەسە بڵێن: شۆڕشی نیشتمانی کورد، کۆتایی هاتووە، وەک لەساڵی - ١٩٢٥ ز - داکردیان، بەڵام راستیەکەی بەپێچەوانەوەیە، ئەبێ دنیاش بزانێ ئەو شۆڕشەی کەنیشتمان پەروەرانی خۆبەخت کردوو، بەرپایان کردووە، مادام ئاگر و ژیلەی نیشتمانی و غیرەتی نەتەوایەتی ئیسلامەتی هەیە، کە دەسەڵاتی خواوەندی لەدڵی نەتەوەی کورددا گەشاندوویەتیەوە، هەرگیز دانامرکێتەوەو، هەرئەگەشێتەوەو، هەرئەگڕێ ...

لەکوتاییشدا سەرلەنوێ دووبارەی ئەکەینەوە، کەئەم شۆڕشە: بەدەست هێنانی دووشت نەبێ، کۆتایی نایەت: یان هەرچی سەرباز و فەرمانبەری تورک هەیە، لەکوردستانی پاک وخۆشەویستدا دەربکرێ، یان تائەوکاتەی تاکەفیشەکێک لەکوردستاندا نامێنێ، واتە دوا پێشمەرگەی کورد، شەهیدئەکرێ.

---

2- لەو وتارەیدا کە - مەحمود ئەسعەد بەگ - ی وەزیری دادی کۆماری تورکیا، لە - ئودەمش - دا وەک لەرۆژنامەی - ملیەت - ی رۆژی 19 ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1930 ز - بڵاوبوتەوە.

# بزنەتەوەی عەرەبی بەخشندە

بەچاکمان زانی ئەم کتێبە بەوشەیەکی کورت کۆتایی پێ بهێنین کە ئاراستەی نەتەوەی عەرەب وئەوانەیان بکەین ، کەلە بواری سیاسەتدا کارئەکەن ، ئومێد ئەکەین جێگای خۆی لە دڵ ودەروونی خاوەن هەڵوێست وبینین و هیمەتەکانیاندا جێی خۆی بکاتەوە .

برایانی عەرەبمان ، لە عیراق وسوریا وحیجازو یەمەن ، ئەوئازارانەیان لەبیرنەچووە ، کەلەرۆژانی حوکمداری تورکدا ، چەشتوویانەو ، ئەو بێ مروەتییەی لەگەڵیان کراوەو، دیویانە ، شوێنیان هەرلەبەرچاو ماوەو ، لەبیرەوەریشدا هەرلەیادن .

ئێمە دڵنیاین لەوەی کەسەرەرای ئەوەی هەندێکیان ئێستا ،بەدەست تەرزی ئەوانەوە ئەناڵێنن ، کەپەیمان وبەڵێنیان بۆ ئەرازاندنەوە ، یادی ئەوئازارو تاوان وناڕەوایی و بێ مروەتییان لەبیرە ، کەلە سەردەمی رابووردوودا لەگەڵیان ئەکراو بەئازارو ناڕەواییەوە یادی ئەوسەردەمە بەسەرچووانە ئەکەنەوە کەستەمی لێپرسراوانی تورک و سەرکردەکانی سوپاو فەرمانبەرانی هەمەچەشنەو، هەمەپلە ئەیانڕەتاندن و ، زوڵم وزۆرو دەردەسەریان پێ ئەچەشتن ، دیمەنی ئەوسێدارانەش کە ـ جمال السفاح ـ ی خوێن ڕێژ، لەسوریا دایانابوون ، هێشتا هەرلەبەر چاون و دیارن ، ئەوناڕەواییەش کەلەئەنجامی بەرپاکردنی شۆرشی 1916 ز- دا لەگەڵیان کردن و، رزگاربوونی حیجازو سوریاو عێراق ، لەکوت وپێوەندی گرانی تورک ، هەموویان بەڵگەن .

گومانی تیانیە زۆربەی روناکبیرانی عەرەب ،بەشداری ئەوەمان ئەکەن کەپێویستە خۆلەومەترسیەی تورک بپارێزرێ ، کە هێشتا هەڕەشەلەپاشەرۆژی وڵاتانی عەرەب و، ئەویەکیەتییان ئەکات ، کە هەوڵی بۆئەدەن ، چونکەتورک هەرلەهەل ئەگەرێن بۆدەست بەسەرا

گرتنەوەی - موسل وحەلەب و ئەسکەندەروونە - و[1] داگیرکردنی ئەوسێ ولآتەو ، لەناوبردنی تەواوی بنەمای یەکێتی عەرەب ،ترسێکی بەردەوامە لەسەر سوریا و عیراق .

کاتی خۆی عەرەبیش ، وەک داروباری ئێستای کوردستان هەمان دەردی توندوتیژی تورکیان چەشتووە ، بەلآم کوردستانی دابڕاولە هەموو دنیا ، خۆی لە بەرسەختترین لێیداندا راگرتووە ، کەنەوەکانی جەنگیزخان ئاراستەی نەتەوەیەکی ئەکەن ، بەختی وای هێناوە ملکەچی حوکمیان بێت و، ژێردەستەیان بێت .

ئێمە ئێستا کە بانگی نەوەکانی - عەدنان - و - قەحطان -ئەکەین ،بۆ بزوتن ، داوایان لێ ئەکەین دەستگیرۆیی نزیکترین دراوسێ وهاوبەشی دەردەسەری دوێنێیان بکەن ، تاشمانەوێ شتێکیان لە ئەستۆبگرین ، لە توانای ئەوهەڵوێستەی ئێستایاندا نەبێ ، کەئەویش هەر ئەنجامی سەردەمی گۆڕکراوی تورکە ، بەلآم ئەگەر ئازادیخوازانی عەرەب ، بەکەرەسەی شەڕەوە نەگەنە فریای ئازادیخوازانی کورد، ئەوا ئەوەش کەم نییە ئەگەرئەوان بە - قسە - فریای ئەمان بکەون ، وەک قسەکەی - موتەنەبی - پەندبێژ ، کەئەلێ :

لاخَيلَ عِندکَ تُهديها وَلامال      فَليسعدالنطق إذا لَمْ تَسعدالحال

——— ——— ——— ——— ——— ———

---

1- ئەم کتێبە پێش داگیرکردنی - ئەسکەندەروونە - بلآوبوتەوە کەلەساڵی 1937 ز - داداگیرکراوە(م)

# خستنه ڕووی ئه‌و کوشتارکاری و ئاره‌وایه‌ی که‌ پێشتر ئاماژه‌ی بۆکرا

### کوشتاری ناوچه‌ی لیجه

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژماره‌ی کوژراو |
|---|---|---|
| بیشته‌ت | 40 | 200 |
| هه‌راق | 50 | 250 |
| فه‌را | 30 | 150 |
| باقین | 150 | 848 |
| ماطمور | 15 | 15 |
| مه‌لیکان | 50 | 249 |
| جوف هین | 25 | 120 |
| بارسام | 23 | 64 |
| مازمار | 40 | 198 |
| سیتی | 60 | 299 |
| ته‌په‌کوی | 70 | 349 |
| چیلکه‌نی | 40 | 200 |
| سردی | 50 | 249 |
| دیرقام | 30 | 150 |
| جامالاش | 40 | 200 |
| فیسی | 60 | 298 |
| فته‌تیس | 52 | 260 |
| شه‌قلات | 70 | 398 |

| ناوی گوند | مالّی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
| --- | --- | --- |
| هوری | 30 | 150 |
| رەزا | 60 | 292 |
| عین گول | 15 | 75 |
| دایلا | 30 | 147 |
| شەللی | 120 | 585 |
| کوللی | 15 | 75 |
| مازفی | 30 | 150 |
| فرهات | 18 | 90 |
| ئیزدینی | 16 | 87 |
| ئالەک | 15 | 74 |
| بەرمال | 10 | 49 |
| طوزالە | 30 | 148 |

## کوشتاری ناوچەی دارهینی

| ناوی گوند | مالّی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
| --- | --- | --- |
| فررسوها | 45 | 12 |
| ئەردیشات | 15 | 4 |
| کلدان | 10 | 8 |
| سوکیغ | 12 | 12 |
| کەشکودار | 8 | 50 |
| کەرلەنووسی | 10 | 18 |
| شەنیشان | 25 | 36 |
| مەزەکور | 8 | 12 |
| سیفان | 300 | 150 |
| شیرنان | 20 | 7 |
| ئیوەرمین | 10 | 18 |

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
| --- | --- | --- |
| قوربنی | 15 | 12 |
| مەرادان | 30 | 17 |
| کیس باس | 7 | 13 |
| تیحاق | 15 | 13 |
| بوخان | 15 | 37 |
| موسکی | 10 | 13 |
| قازونا | 80 | 13 |
| مەزری کبیر | 33 | 22 |
| قولەن | 15 | 21 |
| خان صور | 80 | 25 |
| هوت | 30 | 12 |
| سیزا هیل | 15 | 20 |
| طارباجور | 200 | 85 |
| شین | 32 | 80 |
| ئاشکە صور | 18 | 2 |
| دیری قوری | 13 | 5 |
| بازام | 16 | 2 |
| ئاراکیل | 18 | 3 |
| ئاراکیل صغیر | 30 | 20 |
| عەلی چاپان | 28 | 10 |
| ئاراکیل بوسرداق | 50 | 18 |
| کەرمیک | 16 | 12 |
| درشمالان | 21 | 14 |
| جیرەک | 25 | 3 |
| زیارەت | 19 | 20 |
| والیس | 90 | 28 |
| موران | 50 | 4 |

| ناوی گوند | مالّی سووتاو | ژماره‌ی کوژراو |
|---|---|---|
| روت جا | 100 | 75 |
| جحه‌نی | 80 | 45 |
| قوریات | 150 | 12 |
| بورمه‌ک | 18 | 11 |
| به‌هیره‌پیر | 19 | 22 |
| دیلکتان | 16 | 15 |
| دری نالی | 28 | 25 |
| ئالیان | 160 | 89 |
| ئه‌لفیان | 50 | 80 |
| که‌یدا مور | 16 | 33 |
| مه‌لاعبدالله | 30 | 16 |
| حه‌لالات | 19 | 17 |
| ئاسکی کوی | 16 | 11 |
| خرابه | 26 | 9 |
| لیتومیر | 20 | 8 |
| قارتانج | 5 | 12 |

کوشتاری ناوچه‌ی ئه‌ردوشین

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژماره‌ی کوژراو |
|---|---|---|
| کهات | 25 | 5 |
| قوچگیر | 10 | 9 |
| قوف | 30 | 163 |
| سایه‌ر | 15 | 75 |
| بروج | 25 | 4 |
| کیلیدار | 5 | 12 |
| سفان | 15 | 27 |

## کوشتاری ناوچەی جبا قجور

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
| --- | --- | --- |
| ئازیزا | 65 | 5 |
| شاهینز | 45 | 22 |
| سەیدان | 25 | 120 |
| سیفی | 40 | 15 |
| ئەنفیوقی ژوور | 207 | 12 |
| ئەنفیوقی ژیر | 37 | 18 |
| بەک | 50 | 29 |
| توص | 25 | 13 |
| هیزابان | 10 | 9 |
| فاهزیان | 20 | 12 |
| جانی | 47 | 95 |

## کوشتاری ناوچەی نصیبین

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
| --- | --- | --- |
| کەرهیشی | 35 | 40 |
| کەرطوبین | 100 | 5 |
| ئاربەر | 45 | 50 |
| بەرکین لو | 15 | 20 |
| تەل مجار | 20 | 19 |
| تەل یەعقوب | 10 | 52 |
| شویشەک | 50 | 76 |
| باقیسان | 30 | 62 |

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژماره ی کوژراو |
|---|---|---|
| غورین | 35 | 19 |
| قالا | 200 | 35 |

## کوشتاری ناوچه ی جباب

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژماره ی کوژراو |
|---|---|---|
| مارین | 50 | 50 |
| کیبری مینا | 40 | 70 |
| مرباب | 40 | 12 |
| گوندی شه ترو | 45 | 50 |
| ته ل حه سه ن | 38 | 40 |
| ته ل جیحان | 102 | 50 |
| ئه زناورو | 30 | 28 |
| بادیب | 50 | 15 |
| حه ربه ی نیشکا | 15 | 19 |
| سیدری | 20 | 15 |
| حه ربه ی عه لی | 120 | 150 |
| حه ربه ی کفر | 35 | 86 |
| نفرحباب | 20 | 12 |
| ئابش | 30 | 5 |
| بامینه م | 40 | 80 |
| گولصوار | 60 | 19 |
| کنه ک | 25 | 60 |
| قولبیقان | 20 | 28 |
| شوشانی | 50 | 25 |
| کیوه | 40 | 60 |
| فاضلیر | 45 | 28 |

## کوشتاری ناوچەی ئەلیان

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
|---|---|---|
| ئەل سیفان | 35 | 71 |
| ستوران | 40 | 80 |
| ئەبدکان | 50 | 100 |
| دلاوی قەسری | 60 | 107 |
| حاجی کیان | 30 | 90 |
| هەرامیشکی | 50 | 120 |
| سرکانی | 15 | 70 |
| حاراب سکوزە | 20 | 50 |
| حاراب قوسنە | 25 | 60 |
| دیبەک | 100 | 64 |
| دیترون ئاغا | 25 | 160 |
| قیمان | 30 | 50 |
| شیخ خضر | 25 | 59 |
| بارود | 20 | 60 |
| شابورق | 20 | 60 |
| قان حراب | 30 | 45 |
| بانح | 15 | 75 |
| برنجی | 170 | 35 |
| ئالاقامیش | 30 | 315 |

## کوشتاری ناوچەی مدیان

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
|---|---|---|
| باجین | 80 | 40 |

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژماره‌ی کوژراو |
|---|---|---|
| که‌مالاب | 20 | 18 |
| باربانس | 30 | 20 |
| دالین | 150 | 220 |
| نبل | 100 | 195 |
| موقری | 70 | 120 |

.کوشتاری ناوچه‌ی باجه‌رین

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژماره‌ی کوژراو |
|---|---|---|
| درشامی | 15 | 52 |
| کسفرب | 75 | 160 |
| قارتمین | 10 | 29 |
| نفباجه‌رین | 45 | 18 |
| تحزری | 30 | 19 |
| صوران | 40 | 55 |
| داسفان | 30 | 67 |
| قاقوان | 25 | 56 |
| مسده | 30 | 60 |
| ثاینورد | 30 | 67 |
| مزیره | 120 | 220 |
| توقه | 20 | 58 |
| کفژه‌یی | 50 | 78 |
| هابینتا | 18 | 48 |
| که‌می | 25 | 28 |

## کوشتاری ناوچەی کربوران

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
|---|---|---|
| دیر صلیب | 30 | 62 |
| هەرمین | 20 | 82 |
| حەلەک | 22 | 28 |
| دیرهان | 10 | 25 |
| هیمان | 12 | 18 |
| قصرشیرین | 15 | 28 |

## کوشتاری ناوچەی دیاربەکر

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
|---|---|---|
| قوغنی | 50 | 28 |
| باشمەللو | 40 | 50 |
| قامیشلو | 35 | 40 |
| قورقچی | 13 | 58 |

## کوشتاری ناوچەی کنج

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
|---|---|---|
| ملکان | 80 | 122 |
| هەزارشاه | 60 | 82 |
| بروج | 25 | 68 |
| ئیفاک | 28 | 40 |
| صولاحان | 100 | 150 |
| خەربەزو | 30 | 84 |
| پەک مال | 18 | 56 |

| ناوی گوند | مالی سووتاو | ژمارەی کوژراو |
|---|---|---|
| ئازاد | 32 | 64 |
| قاص | 17 | 40 |
| بوقلا | 100 | 45 |
| غاکبی | 40 | 64 |
| مارکیفت | 8 | 19 |
| سترباس | 10 | 48 |
| مەلاپیرما | 25 | 64 |
| سەربا | 50 | 80 |
| ئینکاق | 20 | 64 |
| ئیفنون | 25 | 80 |
| میتسیازار | 30 | 60 |
| قامیقان | 20 | 40 |
| قامی رەش | 30 | 50 |
| طوصلا | 150 | 180 |
| جرک | 60 | 28 |
| بورا | 30 | 48 |
| جیبا | 30 | 60 |
| چوریکشیما | 10 | 28 |
| باخچە | 80 | 40 |
| سەبیرانە | 5 | 15 |
| قەرەبالچیق | 60 | 88 |
| ساغیفس | 60 | 92 |

# یادداشتەکەی شەریف پاشا.
# بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس

پێش ئەوەی دەقی یادداشتەکەی ـ شەریف پاشا ـ بڵاو بکەینەوە ، ئەمەوێ بیری خوێنەری بهێنمەوە ، کەناوەڕۆکی یادداشتی ناوبراو ، تێکڕا تایبەتە بەماف وخاکی ، کوردو کوردستانی تورکیاوە ، هۆیەکەش ئەوەیە کەئەم یاددا شتە لەئەنجامی پەیوەندی ودا واکاری کوردەکانی تورکیاوە ، کە ـ شەریف پاشا ـ یان پێ‌سپێری کردووە ، تابەناوی ئەوانەوە یادا شت بخاتە بەردەم کۆنگرەی ـ ئاشتی ـ لەپاریس و، یاداشتەکەش ئەو بەرهەمەگرنگەی لێ ‌هاتە ئەنجامدان کە (٣) بەندی تایبەت لە بڕیارەکانی کۆنگرەی ـ سیڤەر ـ بۆمافەکانی کوردستانی تورکیا ـ ی تیا مۆرکراو ، بەپێی ئەو ( ٣ ) بەندە کەبریتین لەبەندەکانی: ( 62 ، 63 ، 64 ) قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ، بۆکوردستانی تورکیا ، پێک بهێنرێ بەڵام داخەکەم ، ئەم بڕیارەی کۆنگرەی ـ سیڤەر ـ ئەوەندەی لای دەوڵەتانەوە ، بەتایبەتی تورکیا ، پشت گوێ خراو، کاری بۆ نەکرا ، ئەوەندەش لای‌کورد، خۆیەوە ، هیچی بۆنەکرا ، چونکە مەسەلەی کورد ئەگەریەک مەسەلەبێ ، ئەوالەوسەردەمەدا ، شۆڕشگێران و روناکبیرانی کورد ، بۆئەم مەسەلەیە ، گردنەبونەتەوەو، تەقەللای چەندلایەنیان یەک نەخستووە ، چونکە هەرلەوکاتەدا کەکوردستانی تورکیا ،لەگەرمەی‌شۆڕشدا بوون ، لەهەمان کاتیشدا ، لەکوردستانی عێراق ، بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمودی نەمر ، شۆڕشێکی بەتین لەئارادبووە ، لەم رووەوە بەچاکی ئەزانم بیروڕاو هەڵوێستی سیاسی‌ی ، کەڵەروناکبیرێکی ئەوسەدەمەی وەک ماموستا ـ رەفیق حیلمی ـ بەیادی خوێنەری کورد بهێنمەوە ، کە خۆی لەسەردەمی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود دا ، جێگای دیارو ئاشکرای هەبووەو، ئاگاداری تەواوی لەباری سیاسی ئەوسەردەمە هەبووە ، وەک

خۆی دواتر، لە بەرگەکانی یادداشتەکانیا تۆماری کردوون.

"مەسەلەی کورد و سەربەخۆیی کوردستان، هەر لە رووی سستی و فرو فێڵی ئینگلیزەوە بە ئەنجام نەگەیشت، لەمەدا کوردەکان خۆشیان بەشدارن و، ئەتوانم بڵێم کە تانووتی گەورەتر ئەبێ لە کوردەکان خۆیان بگیرێ، چونکە جارێ کۆمەڵە سیاسیەکانی کورد، کە ناوچەیان لەئەستە مووڵ بوو، لەگەڵ ئەمەشدا کە ئەندامە ناودارەکانی خەڵکی سلێمانی بوون. ئەوەیان بە بیرانە هاتبوو کە بە ناوی کۆمەڵەکانەوە، ئەمانە بنێرنە سلێمانی بۆ یارمەتی دانی - شێخ مەحمود - و، رێکخستنی کاروباری ئەو حکومەتە کوردە، کە بە راست و درۆ، هاتبووە ناو، لە کاتێکدا کە ئەچوونە ئاسیای بچووک و ویلایەتەکانی خۆرهەڵاتی تورکیا و، لە ناو کوردەکانی ئەوناوەدا، تەقەللای بێ سوودی کوردایەتیان ئەدا و بۆ بڵاوکردنەوەی بیری دامەزراندنی کوردستان تێ ئەکۆشان و، خۆیان ئەخستە دەرەکە و مرۆویان نەئەکردە هەرێمی سلێمانی و، هەولی ئەوەیان نەئەدا کە لە شێخ مەحمود کەڵک وەربگرن و، حکومەتەکەی لە دەستکاری ناراست و نەفامەکان بپارێزن، بناغەی بە هێزبکەن تا نە رووخێ و بژی . بە کورتی لەم لایەنەوە هەڵێکی ئێجگار هەڵکەوتووی گەورەیان لە کیس دا و، کەڵکیان وەرنەگرت لەوە، کە لە کوردستانی عێراقدا ماوەیەکی هەرە ٔ ورمبەدمستموە بوو تەقەللای تیا بدرێ بۆ مەسەلەی کورد.

ئەوانەش کە لە تورکیا بوون و، بە تایبەتی سپەرەک عەشیرەتەکان وناودارەکان، وەکولە موئتەمەری - ئەرزەرووم[2] - دا بینیرا بوو، بە چەشنی تورکە نیشتمان پەروەرەکان و، بە ڵکولەوان زیاتر و بە راست تر، پشتی - مستەفا کەمال - یان گرتبوو، وەبڕیاریان دابوو بە شەڕی (خو.....؟) واتە شەڕی رزگاری - وڵاتی شەریکایەتی کوردوتورک - واتە : شەڕی ئیستیقلال! ئەوشەڕەکە ئەنجامەکەی - داخەکەم - مەحکەمەی ئیستیقلالی لێ پەیدا بوو، کە لاوەکان و گەورەناودارانی کوردی بە کۆمەڵ ئەخنکاندو، ئەیانان بە نیشانی تفەنگ وشەست تیرەوە.

ئەگەر بهاتایە و، پێش سەرکەوتنی - مستەفا کەمال - کۆمەڵە سیاسیەکانی کورد، دوربینیان بکردایە و، هەندێ لە ئەندامە وریاکانی

خۆیان بنا ردا یە تە لای ـ شێخ مەحمود ـ و بەپێی بەرنامەیەکی سیاسی و قەومی ، بزووتنەوەکانی کورد، لە عێراق وتورکیا ، یەک بخرایەو، پێکەوە لەسەرئەوبەرنامەیە بڕۆشتنایە ، زۆرجێگەی باوەڕبوو، کەمەسەلەی کورد رەنگێکی تری وەربگرتایە . ئەنجامی شێخ مەحمود ـ یش بەم جۆرە نەئەبوو کە چاومان پیێ کەوت[1] ! "

دیسان هەرمامۆستا ـ رەفیق حیلمی ـ سەبارەت بەویادا شتەی لە شۆڕشەکەی ـ شێخ محمود ـ ەوە ، کەئەبوایە بنێردرێ بۆ ـ شەریف پاشا ـ و ، بخرێتەتەک یادا شتەکەی تری ـ شەریف پاشا ـ ئەڵێ :

" شێخ مەحمود ـ مەزبەتەیەکی بەئەهالی عەشایەری ئەم هەرێمەمور کرد، کەبەپێی ئەمە : شەریف پاشا ـ ی کوردی دانیشتووی پاریس کرا بە نوێنەرێ کوردەکان ، لەکۆنفرانسی ئاشتی ـ دا بۆداواکردنی حقوقی قەومی کورد ، نووسین ورێکخستنی ـ مەزبەتەکە ـ لەپێشەوە لەمالی ـ حوکمدار ـ پێکهات . بێجگە لەحوکمدار و چەندرەئیس عەشیرەتێکی ناودار، هەندێ لەخوێندەوارەتێگەیشتووەکان و میجەر ـ نۆئیل ـ و، ئینگلیزێکی تریش لەوێ بوون ، داخەکەم ناوەکەیم نەنووسیوە و ، لەبیریشم نەماوە ، من خۆم نووسەری ـ مەزبەتەکە ـ وـنامەـتایبەتیەکە بووم ، کەنێردرا بۆـشەریف پاشا ـ و، ئەمانە بەـ رەشیدکابان ـوـ سەید ئەحمەدی بەرزنجی ـ دا رەوانەی ـ پاریس ـ کراوە[2] . بەلاّم ئەم نامە و مەزبەتەیە نەگەیشتە ـ پاریس ـ و، بەهۆی ئینگلیزەکانەوە ـ رەشید زەکی کابان ـ و ـ سەیدئەحمەد ـ رێی پاریس ـ یان نەدرا و لەحەڵەب مانەوە "[3].

---

1- یادداشت ـ بەرگی ( 3 ) ـ ل 47 ، 48 ، 49

2- یادداشت ـ بەرگی ( 1 ) ـ ل 65 ، 66.

3- یادداشت ـ بەرگی ( 2 ) ـ ل 190

# وەقی یادداشتەکەی ژەنەڕاڵ شەریف پاشا
# بۆکۆنگرەی ئاشتی ـ پاریس ١٩١٩ـز

داخوازییەکانی ـ ئەرمەن ـ کە زیادیان پێوەنرابوو،ئێستا ئەزانرێن ، بۆیە پێیم وایە ئەتوانرێ داخوازییەڕەواکانی نەتەوەی کورد، لەبەردەم کۆنگرەی ئاشتیدا ، دەست نیشان بکرێ .

بەپێی باری سەرنجی ئەتنۆگرافیک ـ زانستی تایبەتی گەلان ـ سنووری کوردستانی عوسمانی[1] ، لەباکورەوە ،لای ـ زیڤان ZIVEN ـ ەوە بــــە تەریبی سنووری قەفقاس ، دەست پێ ئەکات و رووەوخۆرئاوا ئەچێتەوە بۆ ـ ئەرزەرووم ـ ئەرزنجان ـ و کیما KEMA ـ و ـ و ـ ئــەرابکیر ـ و ـ بهیسمی ـ و ـ دیفیک ـ . لەباشووریشەوە بە ـ هەران ـ و زورگەکانی ـ شەنگار ـ و ـ تەلەعفەر ـ و ـ هەولێر ـ و ـ کەرکوک ـ و ـ سلێمانـــی ـ و ـ ئاکلمان ـ و ـ سنە ـ دەست پێ ئەکات ،لەخـــۆرهـەڵاتیشـــەوە بـــە ـ ڕەواندووز ـ و ـ باشکالەی ـ و ـ فیزیرکالی ـ دەست پێ ئەکات،سنووری ئێران ـیش تا ترۆپکەکانی ئارارات ـ ە .

کورد ، لەسەردەمە دێرینەکانی مێژووەوە ،بەچەندان ناوی جیاجیا لەم ناوچانەدا ژیاوە ، کە دیاترینیان لەسیانزە سەدە بەرەوە،بەـ کورد ـ ناسراوە . کوردستان تا ملدانی ئارەزومەندانەی خۆیشی بۆژێردەسەڵاتی سوڵتان سەلیمی یەکەم ،لەچل وشەش میرنشینی سەربەخۆپێک هاتبوو ، کەـ دیاربەکر ـ و ـ دنیقر ـ و ـ چاری سول ـ و ـ لیر ـ و ـ ئاردیال ـ و ـکاکری ـ و ـ ئامێدی ـ و ـ کورکیل ـ و ـ فینک ـ و ـ حەسەن ـ و ـ کیف ـ و ـ جیموچ ـ و ـ گیزک ـ و ـ سیرداسی ـ و ـ ئەکیل ـ و ـسا سور ـ وـهیران ـ و ـ کیلیس ـ و ـ چیروان ـ و ـ دیرزینی ـ و ـ ئیردکان ـ و ـ حـــەق ـ و

---

1- یادداشتەکە لەدەقی فەرەنسایییەوە کراوە بەعەرەبی ، کەسالی 1919 ز ـ لەچاپخانەی ـ LHOIR ـ چاپ کراوە . ( م )

شەریف پاشای سەعید

پاشا خەندان

- ئەرقیل - و - سەیدی - و - سولیمانی - و - ساهران - و - تیرکور - و - کالاییی - و - داودود - و - پلنگان - و - بەتلیس - و - کارزان - و - بۆتان - و . . . هتد . هەموویان لەژێر رکێفی دەسەلاتی ئەم میرنشینە سەربەخۆ کوردیانەدا بوون .

مومسن - لەکتێبەکەیدا دەربارەی مێژووی رۆمانی ، ئەرمینیا - ی لە چاوگەکانی دیجلەو فورات و ، سەرچاوەکانی - کور - دا ، دانا وە ، بەلام دائیرەی مەعاریفی بەریتانی ، کە - نوتالس - نووسیوێتی ،لەو وردترە ، چونکە دەست نیشانی - ئەرمینیا - ئەکات کە " ولاتێکە لە خۆرئاوای ئاسیادا ، ئەکەوێتە خۆرئاوای زەریای - قەزوین - و ، باکووری چیاکانی کوردستانەوە و ، بەسەر تورکیا و رووسیا و ، ئێران دا دابەش بووە ،دەشتێکە دۆلێی بەپیت دابڕدابڕی ئەکات و ، ئەم دۆلانە لەکێوەکانی ئارارات دا

به یه ک ئه گه نه وه " دیاری کردنی ئه م خاکه ، ئه وهه رێمه ده رئه خات ، که پێویسته دا وای بکه ن ، نه ک خستنه ڕووی داخوازی ناڕه وا ، له سه رحسابی ولاتی کورد .

به لام ئه وه ی په یوه ندی به م به ش کردنه ی کوردستانه وه هه یه ، که ئه که وێته مه لبه ندی - ئه رزه رووم - ه وه ، ئه توانری پشت به ڕای زانای جوگرافی - ELIEE RECLUS - ببه سترێت ، که له کتێبه گه وره که یدا سنووره گشتیه کانی ، له ناوچه کانی ئاسیادا ، روون کردۆته وه ، که به تێڕوانینی ئه و ، ئه وه سنووره ڕاستیه کانی خاک وگه لی کوردستانه . ئێمه له کاتی دووباره سه یرکردنه وه ی نه خشه ی جیها ندا ، له گه ڵ ئه وانه شدا که ڕێیا ن داوه ئه م زانا گه وره یه ی جوگرافیا ، له بری ئه وان ، ئه م ئه رکه مرۆڤایه تیه ، له پێناوی چه سپاندنی - مه بده ئی هه رێمه کاندا - له ئه ستۆ بگرێ ، ناتوانین خۆما ن له وسنووڕانه به ده ربنێین ، که ئه و ده ست نیشانی کردوون . " له ودۆلانه دا که هۆزگه لێکی زۆریا ن تیا یه ، به تایبه تی له سه ر درێژایی - زێی گه وره - ، کورد ، نه ته وایه تیه کی به هێز پێک ئه هێنن ، له به رانبه ر تورک وفارس داو ، ئه شیا نه وێ ده وڵه تێکی سه ربه خۆیخۆیان پێکه وه بنێن . " به ناوبانگترین زانای جوگرافیا ، له سالی ، 1884 - دا ئا ئه مه ی سه ره وه ئه نووسێ به پێی سروشتی حالیش لایه نی شاره زای تریش له ناوکۆنگره که دا ، ئه توانێ له مه بکۆلێته وه ، له گه ڵ ئه مه شدا ئێمه ڕێگا به خۆما ن ئه ده ین وسه رنجێک له سه رده وڵه تی چاوه ڕوان کراوی - ئه رمینیا - ده رئه برین و ، ئه لێین ناوچه ی وای پێوه لکێنراوه ، که کورد ، تیایدا زۆربه یه له به رئه وه ش که ئه وانه - کورد - وه رگێڕ - وانا سراون که جه نگا وه ری به هێزن و ، زۆرتوند به خاکه که یانه وه لکاون ، بۆیه که ئاسا یش له م ده وڵه ته چاوه ڕوان کراوه ی - ئه رمینیا - دا ناچه سپێ ، مه گه ر به وه ی ده وڵه ته ها وپه یما نه کا ن ، به شێوه یه کی هه میشه ، هێزێکی سه ربازی تیا دا بنێن ، که ئه م هێزه ش هه رتووشی هێرش هێنا نه سه رئه بێ له شێوه ی شه ری پارتیزانیدا .

- ئه رمه نه کا ن - له ورووژاندنی ما فه کانیاندا با سی - سه رمینیای گه وره - ش ئه که نه وه و ، ئه لێن له سه رده می - تیگرا ن -دا ، واته په نجا

سا ڵ بە رلە زا یین ، دە وڵە تێکی ئە رمە نی هە بووە ، بە ڵام لە بیریا ن چووە ، یا ن لە بیرخۆیا نی ئە بە نە وە ، کە ئە بێ لە پا ڵ ئەم دا وا یە یا ندا ، ئە وە شی بخە نە پا ڵ ، کە هە رێمە کا نیا ن کا تی خۆی ،لە رووی جیها نیە وە ، بە شێکی سە رەکی بووە ، لە ئیمپرا توریە تی رۆما نی و، هێشتا ـ تیگرا ن ـ یش خۆی لە ژیا ندا بووە . کە دووبا رە نە لایە ن ـ پومپی ـ یە وە دا گیرکرا وە تە وە . ئەم سە رنجە ئە وە ش ئە سە لمێنێ کە تا بێ ئە رمینیا ی گە ورە ، بە بنە چە ورە گەزی ئە رمە نی دا بنری و، ئە رمە ن وئە وا نە ش کە دا کوکیا ن لی ئە کە ن ،عە دا لە تی دا خوا زیە کا نیا ن بە وقسە یە بسە لمێنن ، کە چە ندهە زا ر ئە رمە ن ـ ێک لـە کوردستا ندا ئە ژین ، لە بە رپە رچدا نە وە ی ئەم پرۆپا گە ندا نە شدا ، دووبارە پشت بە نووسینە کە ی ـ NUTTALS ـ ئە بە ستینە وە ،کە ئە ڵێ:" ئە رمە نەکان لە کۆنترین سە دە کا نە وە ، کۆچیا ن کردووە بۆ وڵاتە درا وسێکا نیا ن و،ئە ما نە وە ک جولە کە کا ن وا ن ، هە ربە تە نیا خە ریکی کا روبـــا ری بـا زرگـا نین ، بە تا یبە تی پا رە گۆڕینە وە ، کوردیش نکوولّیا ن لە وقسە یە نیە ،کە کە ما یە تی ئە رمە ن ، لە کوردستا ن دا ن و خوولیا ی با زرگا نێتیا ن بۆ دە ست کە وتنی قا زانجی زۆر ، لە م نا وچا نە دا و، بۆ دا دۆشینی کورد، خۆیا ن کـۆچیـا ن کردووە. بۆکوردستا ن " . وا ش تێبینی ئە کرێ لە بە رهە ما ن خولیا ئە ما نە ـ ئە رمە نە کا ن ـ ژیا نیا ن لە شا ردا ، پێ پە سە ندتربووە و،هە ربە یە کجاریش کا رو پیشە ی کشت وکا ڵ ـ یا ن فە را مۆش کردووە .

بۆسە لما ندنی گوزە را نی ئەم کە مە نە تە وا یە تیە ، پشـت بە تا زە تـرین بە ڵگە ی رە سمی ئە بە ستین ، کە لە لایە ن دە سە ڵاتدا رێتی تورک وئە ورووپا وە دە رچووە . ئە وە بوو بە پێی پە یما نی ـ بە رلین ـ لیژنە یە ک لـە ژە نە را ڵی ئینگلیزی ـ BAYER ـ و ـ سە عیدپا شا ـ ی سە رۆکی ئە نجوومە نی دەوڵەتی عوسما نی و ـ مینا س ئە فە ندی ـ کە یە کێک بوو لە پیا وما قوڵانی ئە رمە ن ، بۆ لێکۆڵینە وە و ئا ما ری سە رژما ری دا نیشتوا نی پێک ها ت .

لە وبوا رە شدا هە رتە نیا ئا ما ژە بۆئە نجا می ئە وسە رژمێرە با سکرا وە ، لـە پا رێزگە ی ـ دیا ربە کر ـ دا ئە کە ین ، کە وە ک دە رکە وت سە رتا پا ی ژما رەی دا نیشتوا نی .. 840 000 ـ هە شت سە دوچل هە زا ر ـ کە س بوون ، لە مە ( 6 000 000 / شە ش سە دهە زا ری موسڵما ن و ( 240.000 ) دووسەد و

چل هه زا ریشی دیا ن وجووله که بوون .

له سا ڵی 1895ز - یشدا ، میر - لۆبا نوف - ی وه زیری ده ره وه ی رووسی که نا کرێ ئه میش هه ربه دۆستی کورد دا بنرێ - به ره سمی - گــوزه را نــی ئه رمه نه کا نی له چوا رچێوه ی ده وڵه تی عوسما نیدا سه لما ند کــه ، کــه مــه نه ته وا یه تین .

له ئه نجا می مشتومرێکیشدا ، که له ۳ ی تشرینی دووه می 1896ز - لــه ئه نجوومه نی نیشتما نی فه ره نسی دا کرا وه و، رۆژنا مه ی ره سمی له چــوا ری تشرینی دووه می 1896ز ـــ له 1357 - 1358 دا، بڵاوی کردۆته وه ، وه زیری ده ره وه ی فه ره نسا برا ی گه یا ند ، که " له وهه رێمه تورکیا نه دا ، که ئێســتـا مشتومڕیا نه له سه ری و، به پێی ئه وسه رژمێرا نه ی له به رده ستماندان ،رێژه ی ئه رمه نه کا ن ، له چا و سه رتا پا ی دا نیشتوا ندا له 13% تێپه ڕنا که ن .

دا به ش بوونیشیا ن له هه رێمه کا نی ئا سیا دا چوون یه ک نیه ، چونکــه له هه ندێکیا ندا زۆرن و، له هه ندێکی تریا ندا په رش وبڵاون و ،به واتایه کی تر، ئه م ئه رمه نه کلۆڵانه ، له م پا رێزگا نه دا زۆربه ی دا نیشتوا ن نین ، یا ن نه یا نتوا نیوه له مه ڵبه ندێکدا گردببنه وه تا بتوا نن جــورێک لــه مــا فــی خودموختا ری به ڕێوه به رن ، پا شا ن بۆئه وه ی بیســه لــمێـنین ، کــه که دا خوا زیه کا نی کور، ره وا یه ، چه ندبڕگه یه ک له ونا میلکه یه به بــه ڵگــه دێنینه وه ، که له لایه ن ئه نجوومه نی ئه رکا نی رووســیا وه ئه رچــــووه و ، به شێوه یه کی نهێنی به سه رئه وا نه دا دا به شیا ن کردووه ، کــه زۆر جێی متما نه یا نن . دیا ره نا وه رۆکه که یشی هه ربه ته نیا بۆبه رژه وه ندی سوپا و ، سیا سه تی رووسیا بووه ، بۆیه به م هۆیه وه ئه توا نرێ بوترێ که ئه م نا میلکه یه به را مبه ربه کوردو، ئه رمه نیش بێ لایه نه و ، دیا ریشه ئه م مه به سته ی ئــه م نا میلکه یه ی له پێنا ودا نووسرا وه ، هه ربۆده رخستنی زا نیا ری بووه ،که هــه ر به نهێنیش ئه مێنیته وه .

نا میلکه که با سی هه ردووپا رێزگه ی - وا ن - و - به تلیس - ئه کا ت ،که به گوێره ی قسه ی ئه رمه ن بێت ، گوا یه بێ هیچ چه ندوچونێک ، هــه ردوو پا رێزگه ی ئه رمه نن ، نا میلکه که ده ربا ره یا ن ئه ڵێت : " رێژه ی کــورد ، له م دووپا رێزگه عوسما نیه دا ، له ئه رمه ن زۆرتره ، چونکه رێژه ی کــورد ، له

ـ وان ـ دا ، له (46% و، ئەرمەن 26%) ەو ، لە ـ بەتلیس ـ یشـــدا ڕێژەی کورد ، لە (55%) ەو، بەرامبەربە (35%) ی ئەرمەن ، ئەم ئامارە ناوبراوە ، باسی تورک ناکات لەم دووپارێزگەیەدا ، کەئەوانیش هەمان ئایینی کورد ـ یان هەیە ، کە ـ ئیسلام ـ ە .

هەربەتەنیا لەپارێزگەکانی ـ زان ـ و ـ موش ـ دا ، ڕێـژەی کــوردو ئەرمەن ، وەک یەکەو، لەهەرێمی ـ بەتلیس ـ دا ، کوردلە (50% پێک دێنێ و، ئەرمەن (40%) ، بەڵام لە هەرێمەکانی تردا ڕێژەی کورد، زۆرلە ئەرمەن بەرزترەو، لەهیچ یەکێک لەمناوچانەدا ، ڕێژەی ئەرمەن ناگاتە نیوە ، لەناوچەی ـ هەکار ـ یشدا ، ڕێژەی کوردلە (56%) ی دانیشتوانە. لە ـ سیرت ـ یش لە (60%) ی دانیشتوانەو، لە ـ گیتش ـ یش لـــە لە (79%) یە . ڕێژەی کوردلەم هەرێمانەی دواییدا ئەوەندە بـەرزە کە ئەرمەنەکانی ئەم ناوچانە ، لەکوردی زیاتر بەهیچ زمانێکی ترقسەناکەن. تەنانەت لەهەندێ ناوچەی پارێزگەکانی ـ وان ـ و ـ بـەتلیس ـ دا ، ئەرمەنەکان پیاوانی ئایینیان نەبێ ، ئەوانی تریان پێناسەی خـۆیان نازانن .

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بەدابەشینی ئایینی ، دانیشتوانی ئەم دوو پارێزگەیەوە هەیە ، ڕێژەی موسلمانان لەپارێزگەی ـ وان ـدا ، ئەگـاتە (45%) و، دیان ـ ەکانیش لە (43%) و، ئایینەکانی تریش (3%). لـە ـ هەکار ـ یشدا ڕێژەی موسلمانان ئەگاتە (56%) ی دانیشـــتوانو ، دیانەکان (43%) و، ئایینەکانی تر (1%) . لەپارێزگەی ـ بـەتلیس ـ یشدا ڕێژەی موسڵمانان ئەگاتە (60%) و، دیانەکان (40%) . لـــە ـ موش ـ یشدا ڕێژەی موسلمانان لە (51%) و، دیـــانـەکـان (48%) و ، ئایینەکانی ترلە (1%) . لە ـ سیرت ـ یش دا ڕێژەی موسڵمانان ئەگاتە لە (56%) و دیانەکان (34%) و، ڕێژەی ئاییەنەکانی ترلە (1%) . بە کورتی لەنێوان ئەو (32) قەزایەدا ، کەهەردووپارێـــزگـــەی ـ وان ـ و ـ بەتلیس ـ پێک دێنن. تەنیا هەشت قەزایان دیانەکان تیـایـانـــدا زۆربەی دانیشتوانی پێک دێنن . ئیتر لەقەزاکانی تردا مـوسـڵـمـانان

زۆربەی دانیشتوان پێک دێنن تیایاندا [2].

ئەم بەڵگەنامانە ،هەمووشیان لەکاتێکدا ئامادەکراون ، کــە ئــەو کاتە ساتە دڵتەزینانەی بەرامبەر بە ئەرمەن ئەکران ، سۆزوبەزەیی هەموو ئەوروپا لە پاڵیاندا بووە ، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەدەرئەخــات ، کە هەرگیز ئەرمەنەکان ، لە هیچ بەشێکی ئیمپراتوریەتی عوسمانیدا زۆربەی دانیشتوانیان پێک نەهیناوە ، هەرلەبەرەمان سۆنگەش ئەرمەنەکــان لەکوردستانیشدا ، زوربەی دانیشتوان پێک ناهێنن ، کەبەبەشێک لــەو ئیمپراتۆریەتە دائەنرا .

ئەتوانرێ بەڵگەیەکی تریش بۆئەوە بهێنرێتەوە ،کەکورد ، لەمناوچانەدا زۆربە پێک دێنن ، ئەویش ئەوەیە ، ئەوتیپ وهێزانەی پێیان ئەوتــرێ حەمیدی ـ تائێستاش هەربەتەنیا لەم دوو پارێزگەیەدان ،ئەم تیپانەش ـ ئەندامانی هۆزەکانی ـ حەیدەرانلی ـ پێک دێن ،کە ـ محمد صادق بەگ ـ سەرۆکیانەو ، لە ـ شاقلی ـ کە ـ جەعفەر بەگ ـ ســەرۆکیانەولە ـ ئادامانلی ـ کە ـ عەلی بەگ ـ سەرۆکــیانەو لە ـ موکروری‌کە ـ محمد بەگ ـ سەرۆکیانەو، لە ـ شیمسکی ـ کە ـ صادق بەگ ـ سەرۆکیانەو،لــە ـ شیکیا ـ کە ـ شەریف بەگ ـ سەرۆکیانەو، لە ـ ئامادونلی ـ کـــــە ـ سلێمان بەگ ـ سەرۆکیانەو، لە ـ هەسنانلی ـ کە ـ فەتحوللابــەگ ـ سەرۆکیانەو، لە ـ جبرانلی ـ کە ـ ئیبراهیم بەگ ـ سەرۆکیانـــەو، لـــە ـ تاکوری ـ کە ـ حسین بەگ ـ سەرۆکیانەو ،لە ـ ئیرتوش ـکە ـ حەسەن بەگ ـ سەروکیانەو،لە ـ پینیان ـ کە ـ لوتفوللابەگ ـ ســەرۆکــیانەو، لە ـ شیدانلی ـ کە ـ عومەربەگ ـ سەرۆکیانەو، لە ـ ئالاش و حەیدەرانلی ـ کە ـ حاجی دیمیر پاشــا ـ سەرۆکیانە .

هۆزی ـ حەیدەرانلی ـ کەشەش تیپی ـ حەمیدی ـ لێ پێک هاتــووە ، لەنێوان خۆرهەلاتی زەریاچەی ـ وان ـ وخۆرئاوای زنجــیرە چـیـــای ـ ئالاداغ ـ دان ، تیرەیەکی تریش لە ـ حەیدەرانلی ـ هەیە پێی ئەوترێ ـ ئاهار ـ حەیدەرانلی ـ ، لە ـ نوداک ـوما لازجیرت ـ و ـ هــیریش ـ

2- سەبەست لەکوردستانی تورکیا ، میرالی ئێستایە . ( م )

نیشته جێن . دوای ئه میش له رووی ژماره وه ، هوزی - هه سانلی - دێت ، که له نزیک - مالازجیرت - و - هنس وبولانیکه - نیشته جێیه و ، پێنج تیپ پێک دێنن ، که سیانیان له پارێزگای - به تلیس - ن . به پله ی سێیه میش هۆزی - هیدمانلیله ر - دێت ، که له سه ر درێژایی روبـــاری - زیـلان - نیشته جێیه . به لام هۆزی - جه برانلی - له دووتیپ پێک دێن وله قه زای - قارتو - نیشته جێن ، به لام هۆزه کانی تریان ، له چـــاو ئـــه و هـــۆزه باسکراوانه ی سه ره وه دا ژماره یان که متره و ، هه ریه که شیان لـــه تـــیپێک زیاتر پێک ناهێنن . هۆزی - شانلی - یش له سه ر رۆخـــی خۆرهـــه لاتـــی زه ریاچه ی - وان - نیشته جێن . هۆزی - تاکوری - یش لـــه شـــاری - سیرایی - و قه زای - مه حمودیه - ی نزیک سنووری فارس ئه ژین . هه ر به م جۆره هۆزی - میلان - یش له سه رهه مان سنوور ، رووه و خـــۆرئـــاوا نیشته جێن . هۆزی - موکوری -ش هه رله هه مان ناوچه ئه ژین . بـــه لام هۆزی - چیکیا - له قه زای - ئه لپاک - ی به شی ژووروی رووباری - زێ - دا نیشته جێن . هۆزی - شیدانلی - ش له هه ردووقه زای - حـــه مـــیدیه - و ، - نورچین - دا ن ، له کاتێکدا هۆزی - ئالاچی - له - مالاسیرت و ئیرجیج - سه قامگیرن .

جگه له م هۆزه سه ره کیانه ، هۆزی بچوکتریش هه ن و ، له م ناوچـانـــه دا ئه ژین .. سه ره رای به کار هێنانی هه مووجۆره شتێکی وانا شـــایســـــته ش به رامبه ر ، ئه م هۆزانه ، که له رانه به ده ره ، به لام به هـــۆی پـــابـــه ندی رۆله کانی ئه م هۆزانه وه ، به ره وشت وخووی نه ته وایه تی وئازادیـانـه وه ، نه یان هێشتووه سه رۆکه کانیان ، مل بۆمیری بده ن . پێشـــمان وایـــه که ته نانه ت به هۆی یارمه تی ده سه لاتێکی ئه وروپاییشه وه ناتوانـــرێ ئـــه م خه لکه زۆره جه نگاوه ره کوردییانه ، قایل بکرێن بچنه ژێر ده ســه لاتی که مـه نه ته وه ی ئه رمه نه وه[3] .

مسیونێره[4] سه رگه رمه کانیش ، بۆیه که م جار ، که هاتنه کوردستان بـه

---

3- ئاماره تایبه تیه کان به پارێزگه کانی - وان - و - به تلیس - محمدصادق به گ - لـه رووســـیه وه کردوویه تی به عه ره بی .

4- مـــسیونیر : مُبَشِّر ( م )

په رۆشی ئا یینه وه ویستیا ن کوردبکه ن به ـ دیا ن ـ ، به لآم کــه بۆیــا ن ده رکه وت ، ئه مه یا ن بۆنا کرێ ، ته قه للای خۆیا ن خسته کا ر بۆ رێنمـا یی کردنی تیره دیا نه کا نی کوردستا ن و، له نا وئه م تیرا نه ی دیا ن ـ یشـدا ، تیره ی ئه رمه نیه ئه رثه دوکسیه کا ن ، که زیا ترئا ما ده ی ئه م پرۆگرا مه بوون ، بۆیه هه رکه له لایه ن ئه م مسیونێریا نه وه ده ست کرا به کردنه وه ی قوتا بخا نه پۆله کا نیا ن پربوو له قوتا بی ئه رمه ن ، ئیتربۆ وروژا ندنی هه ستیشـیـا ن مسیونێره کا ن با سی مێژووی ـ تیگرا ن ـ یا ن بۆئه کردن و، به شا ن وبا ڵ و سه روه ریی ولاته که یا ندا هه ڵئه دا ،که له سه رده می دێرینی ئه م پا شا یا نه یاندا شوێنیا نی تریشیا ن دا گیرکردووه ، بۆیه به هۆی ئه م په روه رده وگۆش کردنه وه بووه ، که پڕبووه له وروژا ندنه وه ی گیا نی مێژینه یا ن ، یـه کـه مـین تـۆوی سه ربه خۆییا ن تیا نێژرا یه وه ، که پا شا ن ئه وئا کا مه گرنگه ی هه بووه .

هه رسه با ره ت به ومسیۆنێرا نه ، جا رێکی تریش ئـه گـه ڕێـمـه وه بۆ لا ی نا میلکه که ی له مه ڕئه نجوومه نی ئه رکا نی رووسیا وه ، که با سکرا ، بۆئـه وه ی ئا ما ژه بۆ ئه وبڕگا نه بکه م ، که تیا یدا ها تووه : " سـی سا ڵێک له مـه وبه ر ، چه ند ده سته یه کی مسونێری کا ثولیکی ، یا ن پروتستا نتی ، لـه هـه نـدێ مه ڵبه ندی گرنگی پا رێزگه ی ـ وا ن ـ و، شا ره کا نی ـ وان ـ و ـ به تلیس ـ دا سه قا مگیربوون ، ئـه وه ی به تا یبه تی له م مسیونێرا نه دا سـه رنج ئه درا ، مسیونێره ئه مه ریکا ییه کا نیا ن بوو، که به پێی روا نینه جـیا وا زی نه رێت و ئا یینی ، خه ریکی پروپا گه نده ی ئا یینی ئه بوون و، ده ستی یا رمه تییـا ن بۆهه ژا را ن درێژئه کردو، قوتا بخا نه کا نیشیا ن له چا و هی تردا ، رێــک و پێک تربوو، جگه له مه ش له وقوتا بخا نا نه دا که مسیونێره کا ن له شـــا ری ـ وا ن ـ و ـ به تلیس ـ دا کردبوویا نه وه ، به شی تا یبه تی بۆ فێرکردنـی پیشه ی هه مه چه شنه یا ن کردبووه وه ، سه یریش له وه دا بوو ئه م قوتا بخـا نه ئه مه ریکا ییا نه له دوا ییدا زۆرشۆرشگێرو سه رسه ختی وا یا ن تیا ده رچوو، که له جیها ندا له هه ره پروپا گه نده چیه کا ن بوو، لـه گـه ڵ ئـه وه شــدا کـه ئه مه ریکا ییه کا ن به لێشا و یا رمه تی ئه رمه ن ـ یشیا ن ئه دا ،که چی ئـه وا نه ـ ئه رمه ن ـ خۆشیا ن نه ئه ویستن .

گیا ن وده روون وچا وبرسێتی با زرگا نچێتیشیا ن وا ی لێکردوون هه میشه

له وه زیاتر داوابکه ن ، که پێیان ره وایه ، یان شایسته یانه .ئه وا ئێستاش داوای چه ندبه شێکی به رینی کوردستان ئه که ن ، که لکێنراوه به ئاسیای بچووک و، له مه شدا به ڵگه وبیانوویان هه رئه وداگیرکردنانه ی ـتیگران ـ ه که له چاوتروکاندنێکدا سڕایه وه و، له وه زیاتر که به راگوزاری به مێژوویاندا ره ت بووه ، هیچی ترنه بووه .

حکومه تی عوسمانی له سه رده می ـ عبدالحمید ـدا به وتنه تـگه پـێ هه ڵچنینه به رده وامه ی ئه وروپا ، که سه باره ت به ئه رمه نه بێزاربووه کـان، تا وڵات به جێ بهێڵن و، ده ست به رداری شوناسنامه ی عوسمانی ببن ، به مه هه زاران ئه رمه نی ، له وهه رێمانه ی قه ڵه مڕه ویه کۆنـه کـه یانـدا سه قامگیربوون ، که به پێی په یمانی ـ به رلین ـ سپێردرا به ئیمپراتۆریه تی رووسی ، بۆیه زۆربه ی ئه و کۆچ کردووانه ، زه وی وزاره کانیان فرۆشت به کورد ، به ڵکوهه ندێکیان هه ر زۆربه ئاسانی به جێیی هێشت به پێی یاسای عوسمانیش ئه وکاته ده ستی به سه رئه وزه وییانه دا ئه گرت ، که له ماوه ی سێ ساڵدا ، له لایه ن خاوه نه کانیانه وه ، ناکێڵرێن و ، لـه دوایيشـدا ئه فروشرانه وه ، له به رئه وه موڵکایه تی ئه وزه ویه جێ هێڵراوانه ، بووه بـه هی کورد، چونکه له ده سه ڵاتدا رێتی حکومه تیان کڕیه وه .

دوای ئاشکراکردنی ده ستووریش ئه وئه رمه نیانه ی له رووسیا دا په نابه ر بوون ، سه یریان کرد رژێمی ـ تزار ـ له رژێمی تورکی توندوتیژوسـه خت تره ، که ڵکیان له و لێبوردنه گشتیه وه رگرت ،که دراو، گه ڕانه وه نیشتمانی ره سه نیان ، به هۆی حکومه ته وه ،که وتنه وه داواکردنی زه ویه کانیان ، کـه کورد کڕیبوویانه وه . له ئه نجامی ئه م ته نگ پێ هه ڵچـنـیـنـه دا ، که دیپلۆماسیه تی خۆرئاوای ـ ئه وروپا ـ ده ستی دابوویه ، حـکـومـه تـی عوسمانی ، ملی بۆ داواکانیان دا ، به ڵام کورده کان له م زوڵـمـه زۆر و ناڕه وایه خرۆشان و زۆربه توندی به ڕه نگاری ئه م ره فتاره بوونه وه .

له به رئه مه لیژانی تایبه تی ئه وروپاییی ، له ئاسـیای بچـووک و لـه کوردستانیشدا پێک هات ، بۆچاره سه رکردنی ئه م ناکۆکیه ، ئـه مـه له کاتێکیشدا بوو، که جه نگی گشتی ،له گه رمه یدا بوو. تێکڕای ئه مانه به ئاشکرا

ئەوەنەرئەخەن ، کە ئەوئەرمەنانەی لەکوردستاندا نیشتەجێ بوون ، بەئارەزوومەندی خۆیان ، جێیان هێشتووە ، بۆیە بۆیان نیە بەناوی یاساوە داوای ئەوزەویانە بکەنەوە .

ئەگەربینرا زۆربەیەکی زۆری دانیشتوان ، دەستەپارچەن لە حوکم کردنی کەمایەتیەکدا ، بەوشێوەیەی پێی قایل ئەبن ، ئاخۆ ئەشێ هیوا لەوەبخوازرێ ، کەکەمەنەتەوەی ئەرمەن ، میراتگری بەڕێوەبردنی گەل ـ ێک بن ، کەلەوان زۆرترن و، لەوانیش پایەبەندترن بە سەربەخۆییانەوە ، وەک گەلی کورد ؟ لەبەرئەوە پێویستە لیژنەیەکی ئەوروپایی تێکەڵ پێک بهێنرێ بۆ وردبوونەوەلە مەسەلەی کڕینی ئەو موڵکانەی لەزەوی وزاری دانیشتوانی کوردستاندا ، لەعەقاردا تۆمار کراون ، ئەگەرئەوانە حەزبکەن لەئەرمینیا کۆچ بکەن ، بەمەرجێ هەمان رێگا ئاسان کردن ، لەلایەن لیژنەکەوە بدرێ بەکوردو، ئەرمەنیش پێی قایل بێ .

بیروراکانی ـ ویلسون ـ پاڵپشتی کوردن لەمافی دامەزراندنی دەولەتێکی کوردی دا ، کەخاوەنی هەمووسەربەستی وسەربەخۆییەکی خۆی بێ ، چونکە بیروراکانی ـ ویلسون ـ کەلەچواردەخاڵ پێک هاتوون ،و لەلایەن حکومەتی عوسمانیەوە سەلمێنراون ، رێ بەکوردئەدەن ، داوای سەربەخۆیی بکات ، بەبێ ئەوەی پەیوەندیان لەگەڵ ئیمپراتوریەتی عوسمانی دا بپچرێت ، کەچەندان سەدە لەسایەیدا ژیاون و، پابەند بوون بەنەرێت و رەوشت وخووی خۆیانەوە .

لەبەر رۆشنایی ئەم روون کردنەوانەی سەرەوەدا ئەتوانین داخوازییەکانی کورد ، بەم جۆرە کورت بکەینەوە :

1ـ بەتوندی ئەو داوایانەی ئەرمەنەکان رەت ئەکەینەوە ، کە لە کوردستاندا داوای ئەکەن و، پێویستە بەگوێرەی ئەونەخشەیەی لەگەڵ ئەم یاددا شتەدا بەرزکراوەتەوە ، سنوور بۆداخوازیەکانیان بکێشن[5] .

2ـ پەروەردەکردنی مەڕومالات ، بەسامانێکی بنەڕەتی کورد دائەنرێ،

---

5ـ بەداخەوە ئەم نەخشەیەم چنگ نەکەوت . ( م )

لە بەر ئەوە بەگـوێرەی ئاوو هەوا گـۆڕین ، پێویست ئەکات گەرمیانو ، کـوێستان بکرێو ، بۆ ئەمەش داوا ئەکـەین ئەم لەوەڕگـایە لە دەرەوەی ئەو سنوورانەدا نەبن ، کە بۆ کوردستان دیاری ئەکرێن •

3 ـ لەکـۆتاییدا داوای ئەومافە ئەکـەین کـە پێمان ڕەوایەو بەتاقە ڕێگایەدا ئەنێین کـە ئەمانگەیەنێتە پێشکەوتن وشارستانێتیو زەمینەشمان بۆ خۆش ئەکات کـە بەروبومی نیشتمانەکـەمان بەکـاربهێنینو ، لەگەڵ دراوسێکانیشماندا بەئاشتی بژین •

هـەروەها تکا لـە ـ کـۆنگرەی ئاشتی ـ ئەکـەین ، لیژنەیەکی نیوە دەوڵەتی پێك بێنێ ، تـا بـەپێی مەبدەئی نـەتەوەکان سەربەرشتی رەتك رشتنی سنووربکاتو ، هەموو ئەو ناوچانەش بێنێتە سەر کوردستان ، کـە زۆربەی زۆریان کـوردن ، خـۆئەگـەر لەو ناوچـە کـوردیانەدا ، بەپێی سروشتی حـاڵ ، خەڵکی لەڕەگەزی تریان تیابوو ، ئەوا یاسایەکی تایبەت دەرئەکـرێو ، ڕێگایان پێ ئەدرێو ، بـەپێی نەریتی خـۆیان ، خـۆیان بەرێوە ئەبەن •

ئەوپەڕی ئاواتمـان بـەکـۆنگرەیەو ، ژیـان و دوا ڕۆژی گـەلێکی رەسەنی ئەخەینە بەردەم ، کـەسوورە لەسەر ژیانەوەی ، ئەگـەر کـۆسپ نەخرێتە رێی بڕیاردانی چارەنووسیەوە کە خۆی پەیڕەوی بکات •

**ژەنراڵ شەریف پاشا**
**سەرۆکی وەفدی کوردی بۆ کۆنگرەی ئاشتی**

---

**ناونیشان : 20 شەقامی میسین ـ پاریس •**

Dr.B.SHERGO

# THE KURDISH MATTER

Translated by:

MOHAMAD H.BAKY

1992

بەرهەمی چاپکراو:

١- زووان - دیوانی شعر
چاپی یەکەم - ١٩٨٠.

٢- گەشتی ریچ بۆ سلێمانی
وەرگێران - ١٩٨٦.

٣- کێشەی کورد - وەرگێران
چاپی یەکەم - ١٩٨٦.
چاپی دووەم - ١٩٩٠.
چاپی سێیەم - ١٩٩٢.

٤- گوڵەکانی دۆزەخ - دیوانی شیعر.
چاپی یەکەم - ١٩٩٠.
چاپی دووەم - ١٩٩١.

ئامادەی چاپ:

١- شینی خواوەند - دیوانی شیعر

٢- گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠.

٣- گۆرانی و مۆسیقای کورد و ژیان و بەرهەمی سەیید عەلی ئەسغەر